# بەیان

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی یە

سەرنووسەر : مصلح مصطفی جەلالی

جێگری سەرنووسەر : محەمەد ئەمین هەورامانی


لەم ژمارەیەدا

لاپەڕە




ناونیشان: دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

مەیدانی خەلانی ـ بەغدا ـ ت ٨٨٧٥٧٩٥/٥ خط

تصميم الغلاف: غانم محمد سعدالله

الاشراف الفني : شكر جاسم

١٩٨٢/٧/٦



# خوبەخشکرنا پێنوسێ من ل «قادسیە صدام»

○ محمد مروری ○

نەراوستە پێنوسێ من
بنفێسە ئەڤرو ژینا من
دێ بنفێسە ، دێ بنفێسە
چماخە لکێ وەڤیا سڤك کرە بانمان
لێ چار کیلو ناهێن هە ژمارونابن من
هندی هەر ستێر ل ئەسمانێ من هەر برشن
نە بژگوش ل وەرزێ بهارێ بشکڤن
خوینا مێرخاسا ل مەیدانێ نەبیت تەڤن
رهێت خەباتێ نە بێژن نێ ئەم هەڤن
ئەم نەنوێکەین وێ دیروکا خۆیا کەڤن
دارێت بلند خو ناگرن دێ هەر کەڤن

وەلاتێ من یێ هۆ شرین
ل ڤێ قادسیا ناڤ زێرین
دوژمن چ جار ژێ نارەڤن
دوژمن چ جار ژێ نارەڤن

★ ★ ★

پێنوسێ من
ڤەت نەبێژە دەوێت نینە
من پێ خوشە
ببم پالەو تو بێژیە من
هلوهەرە سەرێ چیای بەفرێ بینە
سەربەرەکی خوشکوك لیسکە ووێ بحەلینە
ئاڤە تاسپی وەکی شیری ژێ بدەدینە
عومبارا من یاڤا لە بوی تێبهەلینە
نێ دەرمانەو هنگڤنە تێکداروینە

★ ★ ★

یان ژی بچم دولو هلا
رەنگێ بهارێ بدەرینم ژ بەلگێت گولا
دابەم دەرمان بۆ برینێت هەمێ دلا
ل ئەهوازو مەهابادێ
هەم فەلەستینا پەریزادو دل کولا

★ ★ ★

شەڤا تاری دێ چم روژێ لێ هەلینم
داکو تیرو ژ کێت ئەڤینێ ژێ بدەرینم
داڤێت خەباتێ بجەمینم
ژ بۆ دیروکێ بڤەهینم
گەهیا بن ئاڤ وەکی جیدی وێ بهەلینم
بۆ قەهرەمانێ مللەتی ئەمز دێ ئینم
دێ هەر ئینم .. دێ هەر ئینم

★ ★ ★

ژڤان رەنگا گەر نەبینم
ژ بۆ ڤێ جڤاتێ بجەهینم
ئالا خوین مێژو زۆردرا پی بچەهینم
ئامادەمەو دێ هەرهینم
زەندکا خۆ بۆتە بدرینم
داکو خوینا سۆر ژێ بهێت
بۆتە هەڤال دێکەم دەوێت
دابنڤیسی ل سەر بەرپەرا
ل سەر بەلگو دارو بەرا
ئەڤە ئاهەنگە ئەم دکەین
دئەل مەوە ئاگر پەرێسا
داکو سوباهی ئەم بچین
سەرکەفتنا فەلەستینێ بکەین مزگینی
بۆپەهلەوانێ قادسیا زەمینی
سەرۆکێ من ( صدام حسێن )ی

# بەرەو شەڕی قادسیە

نووسینی : هێرۆ زەنگەنە

## بەشی یەکەم

**یەکێك :**

« بە دەنگێکی بەرز » وەللا وەللا وەللا ئەم « سوێنە » سوێنی دادگایە ، ئەمەوێ ئەوەی راستە بۆتانی باس ئەکەم .... بێ زیادو کەم .... زمانی موی لێ بێ ئەوەی ڕاستی نەشێوێنێ ... ئەوەی خۆی ئەکات بە پارسەنگی کێشەکان .. ئەوەی پەراوێزو پالەم ئەکات بە کاکلەی باسەکانو نەژادی کێشە راستی‌یەکان پشت‌گوێ ئەخات .

سەرتان نەیەشێنم ، بە باروتو قورقوشمو پۆلا لە دوژمنانتان بووروژێنم ... با دیدەکانتان بە ( ڕاستی ) مەست کەم .. با ئاگاداری شەڕێ « قادسیە »تان کەم .

* * *

— پاش کۆتایی شەڕە دژوارەکەی « بوەیب » سوپای ( مثنیٰ )ی دلێر پەیتا پەیتا تەکانی ئەداو بەرەو پێش هەنگاوی ئەنا ، تا ( ساباط )و دێی بەغاو تکریتی داگیرکردو هەڕەشەی لە « مدائن »یش کرد . عەجەمەکان هەستیان بەمە کردو ترس دڵو دەروونی داگیر کردن، بویە ویستیان گێرەشێونینی‌یەك بنێنەوەو خەڵکیشی بۆ گاڵ بدەن ... تا لەمپەرێك بۆ هێرشی سوپای « مثنیٰ » دابنێن .

بەڵام مایەپوچ بون .... بۆیە کەوتنە ڕاوێژکردن تا چارەسەری خۆیان بکەن .

**عەجەمی (١) فەلاموزز :**

چارەمان نی‌یە بەر لێشاوی سوپای « مثنیٰ » ناگرین .. سەرو مالمان تیا ئەچێت ... « شەبەیخون » دادمان نادات .. شەڕ بێ شەبەیخون ئاشی بێ‌ئاوە .

**عەجەمی (٢) موهری :**

بەڵێ وایە لە ڕوی ئەواندا شیرمان کولە . ئەسپمان چوارناڵە ناکاو ئەسلەمێتەوەو بەرەو دواوە هەڵدێ .. دلەراوکێو « پەش موردەیش » لە دیمەنی خۆماندا دەرئەکەوێت .

— برا ( موهری ) خەتا خەتای خۆمانە دو هێزی دژوارو دو فەرماندەی پالەوانمان هەیە . بەڵام ئێمە لە ناو خۆماندا تەواو نینو کەسمان بڕوامان بەوی ترمان نی‌یە ... ئاخ « بوران »ی پالەوان وەك باو باران وابویت .. پاش تۆ وا خەریکە بەقڕ ئەچین ... سوپای « مثنیٰ » وەکو باوو ئێمەیش وەکو دەواری شڕ واین .

— فەلاموززی برا «رۆستەم»و « فەیروزان » هەریەك قەستی سەری ئەوی‌تر ئەکەن ... هەریەکەیان ئەیەوێت پایە بەرزتر بێتو لەسەر عەرشدا لەنگەر بگرێتو فەرمانی ئەو بەسەر هەمولایەکدا بسەپێت ... ئەوان بەتەنگی ئێمەوە نایەن ئەوان .

« لەو کاتەدا دەنگی حیلکەو پێی ئەسپ دێت بەرە بەرە دەنگەکە دور ئەکەوێتەوە » .

**فەلاموزز :**

بێ‌تەزابیت .. ئەوە تۆ ئاگات لە خۆت نی‌یە ... چی ئەڵێیت ... تۆ هێرش وەسەر هەردوکیان ئەبەیت . باش‌بوو ئەو سوارانە گوێیان لە دەنگت نەبو .. دنیا ئامانی نی‌یە ... باشە تۆ بۆ ئەبێ بە چاوی قینەوە تەماشای ئەو پالەوانە

بکەیت .... ئێمەی عەجەم ئەگەر لە کێشی سوپای « مثنیٰ »دا نەبین ئەبێ چارەسەرێك بۆ خۆمان بدۆزینەوە .. ئەبێ ... ( بێدەنك ئەبێ ) .

**— ئەبێ چی ؟!**

**— ( بێدەنگە )**

**— نتق بدە ئەبێ چی ؟**

**— ئەبێ ئەم سەرە بەکار بهێنین ... ئەبێ پەنا وە بەر فروفێل بەرین ... ئەبێ (رۆستەم)و ( فەیروزان ) یەك خەین .. ئەبێ ئاشتیان بکەینەوە .. ئەبێ ....**

**— ئەم کارە ـ ( نەکردەنی‌یە ) ـ ئەوان لەگەڵ یەکدا هەڵناکەن .. وەك باوە کوشتەی یەك وان .**

**— گەوجە**

**— کێ گەوجە ؟**

**— ئەوکەسە گەوجە کە خەڵکی بێ گەوج ناکرێت‌و فێڵی بۆ نارەخسێت‌و هەموو شتێك بە پەناوەکی ئەبینێت .**

**— لێت تێناگەم ئەوەی ئەیڵێیت پەناوەکی‌یە .. !**

**— بزانە ... هەندێ لە پیاوە ماقوڵەکان‌و ریش سپیەکان کۆدەکەینەوەو لەگەڵیانا ئەچین تا هەردوو لا قایل نەکەین ناگەرێینەوە ... بە رۆستەم‌و فەیروزان ئەڵێین ئێوە ململانێ لە سەر تەخت‌و تاراجێ ئەکەن بەڵام نازانن سوپای (( مثنیٰ )) ئێوەو تەخت‌و تاراجتان سەرەونگون ئەکەن کەوابوو هەردوولاتان دەستتان لەبنی هەمانەکەوە دەرئەچێ .**

**فەلامورز ، موهری :**

بەم جۆرە لە ترسا هەردوولا پشتی یەکتری ئەگرن .

**موهری :**

( هاهاها هاهاها هاهاها ) فێڵ زانی ئاگری بن کا .. ئەی دواجار ؟

**فەلامورز :**

دواجار هەردوکیان فت .

— ئەی چۆن

— ( یزدجرد )ی شەهرەیار لەسەر تەخت‌و تاراج دائەنێین بەم شێوەیە سوپایەکی گەورەش لە « مدائن »دا حەشار ئەدەین .. دژی سوپای « مثنیٰ »ش بەربەرەکانێ ئەکەین .

— ( بەپێکەنینەوە ) دەم‌خۆش کە تۆ ئەم فێڵە ئەزانیت بۆ لە شوێن ( یەزدجرد ) لەسەر تەختی شاهانەت دانانێێن .



— كاتێ پێكەنین نی‌یە .. ئەی سوپای ( عەرەبەكانت ) لەبیر چوەتەوە .

— بێ‌قەزابیت بیرت خستمەوە ، وا لەرز هەموو ئەندامی داگرتم .

— ئەوەچی‌یە بۆ وا ئەلەرزیت .. ئەلێی لاقەكانت لە لێواری گۆڕ ئەلەرزێت ... ؟!

— ئەی خۆت نالێیت .. بۆ چ هەر من وام ؟

— بە دانیشتن مالّمان وێرانە ... با بڕۆین نەخشەكەمان جێ‌بەجێ بكەین .

* * *

**یەكێك :**

لە كاتێكدا كە هەوالّی كۆمەكی عەجەمەكان تەشەنەی كردو « مثنیٰ »ی فەرماندە هەستی بەمە كرد كە دوژمنەكانی هێزێكی گەلێ بێ‌شوماریان پێك هێناوە ئەیانەوێ بەرەو پێش لێشاو بەرن و هێرش بكەن بۆیە وتی ..

« دەنگی غەلبە غەلبی سوپا .. لە كاتێكدا كە ( مثنیٰ ) ئەدوێ دەنگەكە كپ ئەبێت » .

**مثنی :**

ئەی سوپای جەنگاوەر .. ئەی ئەوكەسانەی لە ڕێی ئاینی ئیسلاما خۆتان بەخت كردووە . مەشخەلّی ڕەواو دادپەروەرتیان بەرزكردۆتەوە دژی كافرەكان ئەجەنگێن.. ئەمەوێ ئاگادارتان بكەمەوە كە ئەبێ بەرەو دواوە بكشێینەوە ، ئەو بنكانە بەجێ بهێلّین كە داگیرمان كردون .. ئەم كشانەوەیش كشانەوەی سوپایەكی ترسنوك نی‌یە ....

**« دەنگی غەلبەغەلب پتر ئەبێت »**



**سەربازێك :**

قوربان ... ( مثنیٰ )ی دلێر هەموو گوێڕایەلّی فەرمانتین بەلاّم ئەم كارە ئەكردەنیە چۆن ... ؟؟!!

**مثنیٰ :**

( وتەكەی پێ ئەبڕێت ) ئەزانم بەوە ڕانەهاتوون كە بەرەو دواوە بكشێینەوە .. چونكە هەمیشە بەرەو پێشەوە تەكانتان داوە .. هەمیشە بەسەر دوژمندا زالّ بون ... بۆیە ئەمەوێ پێتان رابگەینم ئەم كشانەوەیەی ئێمە وەك كشانەوەی شێرێك وایە كە چەند هەنگاوێك بەرەو دواوە ئەكشێتەوە تا چاكتر هێرش بەرێت ئێمەش هێرش ئەبەین تا دوژمنانمان ( زەلیل ) بكەین ... تا عەجەمە رەگەزپەرستەكان ببەزێنین ....

**سەربازێك :**

كەواتا كشانەوەكەمان فێلّی شەڕە .

**مثنیٰ :**

بەلّێ شەڕ فێلّە .

**هەمو :**

باشەكاوەبێت ئالاّكەمان ... با بەقڕچێ عەجەمی خوێنڕێژ .

* * *

**تێبینی : ماوێتی چونكە ئەم نووسینە (١٠) دە بەشە .**

# ئایا هونەرمەندی تەشکیلی خۆی لە سیپالی غەزایەکی پیرۆزدا ئەبینێت ؟

نووسینی : س.ز



وا خەریکە ئەبێ بە دوو سـال لەگـەڵ عەجەمەکاندا شـەڕ ئەکـەین ... ڕۆژبەڕۆژ گوڕەپانی ـەر زیاتر بەرەو ناخی وڵاتی دوژمنـان ئەکشێنین ... ئەوان ئەیانویست شەڕ لە خاکی ئێمەدا بکەن .. ئەیانویسـت وڵاتی عیراقی دراوسـێیان وێران کـەن .. بۆیـە وڵاتـە شیرینەکەمانیان بوردمان کردو ویسـتیان بـە مەترەلۆز شـارەکانمان خاپور بکەن ... بەڵام پەروەردگار لەسەر حەقەو بە ( های هو )ی ئەوان هیچ ناکرێت . بۆیە نەیانتوانی خۆیان لە قەرەمان بدەن لە حەیبەتا ڕایانکردو بەرەو دواوە هەڵهاتن بەم جۆرە نەك هەر وڵاتی ئێمە بگرە لە ترسـاندا شـارەکانی خۆیشـیان بەجێهێشتو زیاتریش شکستیان هێنا ... سەرکەوتنی گەلەکەمان کاری کردە سەر هەموو لقەکانی ئەدەبو هونەر بێگومان هونەری تەشکیلیشی گرتەوە .. ئەو هونەرمەندانەی کە پەنایان وەبەر بیرو خەیاڵی خۆیـان ئەبردو وێنەی شەڕیان ئەخشـە ئەکێشاو بە پەڕەموچ ڕەنگیان بەسـەر تابلۆکاندا دابەش ئەکرد . ئەبێ تامو چێژی سەرکەوتن ببینن و خۆیان بە خەیاڵەوە خەریك نەکەن . ئەبێ ئەوانیش وەکو چیرۆکنوسو جلوبەرگی خاکی لەبەرکەنو سـەنگەری نوێ هۆنەرو ئەدیبەکان بەرەو گۆڕەپانی شـەڕ بڕۆنو هەڵکەنن .. تا لە سەنگەری شەڕدا تەعبیر لـە شـەڕو لـە جەنگاوەران بکەن .. ئەبێ بەردەوام لەگەڵ ( ترپەو نەزم )ی جەنگدا پێکەوە بلکێن .. چونکە ئەم کارە مانای ڕاستەقینە بـەو ( بۆیانە ) ئەدا کە بۆ تابلۆکانیان بەکاریان ئەهێنن واتا مانای ڕاستەقینە بە ڕەنگی خوێن ئەدا .

ئەبێ هونەرمەندی تەشکیلی کەرەسەی خۆی لە ڕوحی سەرکەوتنو پێداویستییەکانی شەڕەوە وەربگرێت .. تا لەگەڵ وڵاتەکەیشیدا لـەنگـەری سەرکەوتن بگرێت .. تا تابلۆکانی وەکو قەڵغـانو سوپەری شەڕ لە شەڕی قادسیەی صدامدا خۆی بنوێنێ ... بەم شێوەیە هونەرمەندی تەشکیلیش ( وەکو هەموو هونەرمەندەکانیتر ) خۆی لە سیپالی غەزایەکی پیرۆزدا ئەبینێت .. ئەو غەزایەی کـە دژی عەجەمە ڕەگەزپەرستەکانە .. ئەو عەجەمانەی کە کوردو عەرەبو ..... ئەبێزێنن .. لە خۆیان زیاتر کەسیان گەرەك نییە .

# لەیادو بیرەوەرییەکانی باپیرەم ...

○ شفیق محمود حسن ○

**دانیشـــە ... گوێ ڕاگرە ... بێدەنگ‌یە .. سەیرکە ..**

**باپیرەم پێی وتم :**

بە ئاسپایی دانیشـــتم .. لەلەفزیۆنەکە فلیمێکی دەربارەی لـە یەکێ لە بەرەکانی جەنگەوە پیشـــان دەدا ..

ســـەیری فلیمەکەم ئەکرد ... ئەوەم بیر کەوتەوە کە مامۆســـتا وەختێ خۆی پێی‌وتبوین .. لەنێوان بینین‌و ژنەوتنا ؛ زۆر جیـــاوازی هەیە .. باپیرەم دەســتی گرتم .. توند توند بەسنگیەوە گرتمیەوە ... بەدوو چاون زاق سەیری فلیمەکەی ئەکرد .

پێی وتم ... سەیرکە چۆن بـەو کەژو کێوەدا ســـــەر ئەکەون !! فڕۆکەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ بەســـەر گردێکەوە نیشتەوە ... ژمارەیـەك لەســـــەربازان لێی دابەزین ... هەورێکی سپی رووی ئاســـــمانی داپۆشیبو ..

لـە ناکاودا وتم ... ئەهـا ... ئەها .. چەند لاشەیەکی کوژراوی سەربازانی فارسی ڕەگزپەرســـتی دوژمن لـە بنـارو لاپاڵی گردەکـەدا بۆتەوە ...

ئەها .. ئەها .. باپیرە ..

ڕۆلە پێتم وت ســــــــەیرکـە بێدەنگ‌بە ..

ها .. ها .. ها .. پێکەنیم .

★ ★ ★

ئەختێ پەنجەکانم دەئێشـــــا .. بەهۆی نووســینی وانەکانمەوە ... دایکم خەرێـکی چێشـــــت لێنـان بوو ... باسی ئەوەی بۆ کردبووم کە باوکم چووەتە ڕیزی تیپەکانی ئەرکە تایبەتیەکانی خۆبەخت کردن ، لـــە پێناوی بەشـــدار بوونی لـە جەنگی دادوەریماندا دژی فارســـــی ڕەگەزپەرستی دوژمن ... ئێستاش باوکم لەبەرەی جەنگدایە .. پێشــی مانگێـك لـەگـەڵ هەڤاڵـەکانیـدا ڕۆیشتووە .

باپیرەم تەنها خەریکی سـەیرکردن فلیمەکـە بوو .. کڕو بێدەنگ ...

جارێکیان بەسەر بەرماڵەوە بینیم ، نوێژی ئەکرد .. ئەگریا ... بەڵام ئەوا ئێســـنا زاق‌زاق چاوەکـــانی بیریوەتە تەلەفزیۆنەکە ... دڵـۆپ دڵۆپ فرمێـسك بە هەردوو چاونیدا دەباری ..

مامۆســـتاکـەمـان پێی وتم .. پیاوان ناگرین ... بـەڵام لەکاتێـکا ئەگرین کە خەوەنیان تێکەڵاوی بیرو دەرونیان ئەبێتەوە ... یەك وشـــە لەو مەبەستە تێنەگەیشـــتم ... پێم وت ... باپیرەم لە کاتی نوێـژ کردنا ئەگریـا ! .. وتی .. ئـەوە



گریانی خۆشەویستی‌یە .. دیسان تێنەگەیشتم .. پێم وت من ناگریم ، تەنها گەر بەیەکەم دەرنەچم ..

**وتی .. تۆ چالاکی .. زیرەکی .. ئەی مەلعون ..**

**وتم .. ئایا من کچێکی مەلعونم !!؟**

**وتی .. ببوورە .. مەبەستم ئەوە نیە بە خراپت دابنێم ..**

باپیرەم پێی وتم ... سەیرکە ... سەیرکە چۆن بەسەر چیاکەدا سەر دەکەون !!

سەرم لەسەر سنگی باپیرەم توند کردبوو .. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە باوکم بەر چاوم بکەوێت ..

هەورێکی ڕەش‌و سپی رووی ئاسمانی تەنیبووەوە .. بروسکە لە لایەکی تریەوە چەخماخە ئەدات .. چەند ئارەزو خواز بووم لەگەڵیاندا ببومایە ..

باپیرەم پێی وتم .. ئەگەر بێت‌و لە قوتابخانەدا سەرکەوتو ( ناجح ) نەبیت ، ئەوا ڕەوانەت ناکەن بۆ جەنگ .. وەرت ناگرن .

ئاخ ... کەی بێت‌و ئەوەم لە بیر بچێتەوە کە لەتەمەنی نۆ ساڵاندا نیم !!

باش سەیرکە ... باپیرەم پێی وتم ..

فرمێسکەکانی لێی دەشاردمەوە ... ئەگریا ... بەجێی هێشتم .. چووە ژوورەکەی خۆی ... نوێژێکی بەپەلەی کرد ... زوو گەڕایەوە ، لە تەنشتی دانیشتم ... ئەگریا هەر وەك بڵێی منداڵێکە فەلاقە کراوە ..

باپیرە بۆ نەگری .. !؟

بەدەنگێکی خنکاوەوە ، ووتی ..

ڕاوەستە ... ئەها .. فلیم ... لەپاشان بۆتی ئەگێڕمەوە ..

لەو هیوایەدا بووم کە باوکم لە فلیمەکەدا ببینم ... ئایا بۆ دیاری نیە وەکو پێشان کە سەڵاوی بۆ دەناردین !!؟

دایکم پێی دەوتم .. سەیر بکە ... سەیرم کرد ... باوکم بینی ... بە مامۆستاکەم وت .. باوکم سەڵاوی بۆ ناردین .. بۆ هاوڕێکانم ... بۆ تۆ ... بۆ هەموو کەسێ ... مامۆستا وتی .. باوکتم بینی .. قارەمانێك بوو .. بە دایکم وت ... باوکم قارەمان بوو !؟ وتی .. بەڵێ لێم تووڕە بوو ... لێی دڵنیا بووم .. وتم .. نیشانەی چیت هەیە کە دوپاتی ئەوە بکات !؟ ..

نامەیەکی بۆ دەر هانیم ( سوپاس نامە ) لەگەڵ ئەو نیشانە کە وەری گرتووە .

لە قوتابخانەدا لە هاوڕێکانم ئەپرسی ... ئایا باوکت نیشانەی وەرگرتووە !!؟ هەموو سەرسام دەمان لە وەرام دانەوەدا ... لەکاتێ پرسیارم لە مامۆستاکەم کرد ، ئایا مێردەکەی نیشانەی وەرگرتووە !! ووتی براکەم . نیشانەی دلێری وەرگرتووە ... بۆ دەرکەوت مامۆستاکەم مێردی نەکردوە .. هەستم بەدڵ تەنگیەك کرد ... چونکە ئەگەر مێردی کردبایا مێردەکەی نیشانەی وەردەگرت !

لە باپیرەم پرسیارم کرد ..

ئایا باپیرە تۆ نیشانەت وەرگرتووە .. !؟ بەدەنگێکی توندەوە .. وتی .. ووس‌بە ... ئازارم مەدە ..

پاش کۆتایی هاتنی فلیمەکە ، خوێنەری دەنگ‌و باس لە تەلەفزیۆنەکەدا ، وتی .. ئابەم شێوەیە خوێنی دوژمن ڕەنگی چەکی مردوی خۆی دەکات ..

لە باپیرەم پرسی .. ئایا باپیرە .. بۆ چەکیش ئەمرێ !؟ بەڵام باپیرەم وەرامی نەدامەوە .. بەدەم گریانێکی بێدەنگا ، هەڵیگرتم ... وتی .. پێشی سی ساڵ چوومە جەنگەوە .. بەڵام بەدڵێکی پڕ بە داخەوە گەڕاینەوە .. باپیرەم دەستی کردە گێڕانەوەی ئەو جەنگە .. جەنگی فەلەستین ، دژی زایۆنیزمی داگیرگەر ... دووبارە دڵۆپ دڵۆپ فرمێسك بەچاوانیدا خوڕ خوڕ دەهاتە خوارەوە ..

**وتی .. بەسیەتی .. ڕۆڵە .. کەم ئازارم بدە ..**

دایکم نانی بۆ هانین ... بەڵام برسیم نەبوو ... هەروا باپیرەشم ... باپیرەم چووە بیرو تێفکرینیکی توولەوە .

وتم .. باپیرە ئەگەر تۆ نیشانەت وەر نەگرتبێت لەو جەنگەدا ، ئەوا باوکم گرتووە ، ئەگەر تۆیش نەبواتیایا ، باوکیشم ئەم نیشانەی وەرنەدەگرن .

باپیرەم دیسان چاوەکانی پڕ بوەوە لە فرمێسك .

ڕۆڵە .. کچەکەم ... ئەمرۆ زۆر ئازارت دام ..

بەڵێ .. ئێمە هەردووکمان فلیمەکەمان بینی .. بەڵام ئایا بۆ من بووم بە هۆی گریانی باپیرەم ..

**وتی .. من لەو هەموو جەنگانەدا کە بەشداریم کردوە بە دۆڕاوی گەڕامەوە ... یەکسەر پێم وت .. ئەبێ منیش بگریم ... وتی .. تۆ بۆ ... وتم چونکە لە هیچ جەنگێکدا بەشدار نەبووم .**

# شینی ڕۆڵەیەکی کورد لە سنە

دڵ بە دنیا خۆش لاوی نێسک‌سوک حەمەی بێچارە
خوێنەواری چاک ژیرو سەر لە ڕێ ڕوڵەی ئەم شارە

——————

چەن دڵت خۆش‌بوو بەم دنیا سپڵە چەن کوڕی چاک‌بووی
پارچەی بۆمبای پیس لێ‌ی‌دای کوشتیتی هەر چەن تۆ پاک بووی

——————

خانەو لانەکەت شێوا وێران‌بوو کتێبخانەکەت
تەنها بەجێت‌هێشت بۆچی بەجێت‌هێشت ژنە جوانەکەت

——————

لەدەس دەسڕێژی گوللەی تەیارەی دەس‌درێژکەران
تەنرابوو ، ڕێگە ساردو سڕەگەی ئەچوو بۆ قەبران

——————

لە ناو کەلاوەی سەوی کۆلانا جێگەت کراوە
بە ژێی سیی پاسدار تەنانەت ڕێگەی قەبران تەنراوە

——————

لە شاری خۆتا لە خاکی خۆتا دوژمنی زۆردار
کوشتیتی نەیهێشت بتنێنە گۆڕێ خوایا هاوار

——————

کۆلانو شەقام بۆنی مەرگ ئەدا بۆنی مردوویە
چ کاریکە وا دوژمنی زوردار لێرە کردوویە

——————

## نووسینی : ا.ن. دلسۆز

ئـەی شـاری سـنە شـارە خۆشـەکە شاری کوردسـتان
بۆ واتالیکـرا بـۆ ویـرانکـرای بوویتـە گۆڕسـتان

---

کـوانێ سـەیرانی دیدگـاکانو(۱) سـەرکانیەکـانت
کـوا کـوڕو کیـژی سـەر مەسـتو شـادو ڕازاوەو جوانت

---

ئەو کەسـەی کـەوا پێتـان وت سـەرۆک بـە هـەموو دڵێ
عـەجـەب گلێـکی کرد بـە سـەرتـانـا ئەمـان چ گلێ !!

---

چەشـتەی ئـازادیو مـافی خـوراوی گـەلی چەوسـاوە
چ تـەڵـەیێـکی سـەختو خوێنـاوی بۆ کـوردان نـاوە

---

بـە تەمـای ڕیشبوون کـە لـەم ڕیش زلـە(۲) وەدەستان کەوێ
وتی سـمێلی هـەموتـان ئەبـرم چـون ڕیشـتان ئەوێ

---

بـە گیـانو بـە خوێن بـە صـەدان شـەهید تاگەل ئـازادبوو
سـەر لـە نوێ وایکرد دینـو دنیاتـان هەمووی لـەدەسچوو

---

وتی ڕزگـارتـان ئـەکـەم لـە دەس گورگ(۳) وتیـان هەربژی
خـۆی بوو بـە قەسـاب هەمووی سـەربـڕیو خوێنیشی مژی

---

(۱) لە ئێرانا بەو سـەرتەپۆڵانـە ئـەڵێن کە ناو شار ، دیمەنی جوانیان لێوە دیارە .

(۲) پەنجە نیشانە گرتنە بۆ لای ئەو پەندەی کە ئەڵێت چوم بۆ ریش سمێڵیشم نایە بانی .

(۳) نیشانگرتنە بۆ لای شیعریکی سەعدی کە بە زوانی مەڕێکەوە ئەڵێ بە قەسـابێک کـە مەڕەکەی لـە دەس گورگێک ڕزگارکردوە . مەڕەکە بە زوانی بێزوانی ئەڵێت منت لە دەس گورگ ڕزگارکرد کەچی خۆت بوویتە گورگ لێم وەسـەرم ئـەبـڕی .

# نەگبەت گیان

* دۆست سەعید *

**گوێستانی‌یەکی کلۆڵ گێڕایەوەو وتی :**

گەلێ شتی سەیر لە سەر دیوارەکانی بەندیخانەکانی ( قوم )و ( تاران ) نووسراوە ... خوایە تۆبە لەسەر دیوارەکانی بەندیخانەکانی هەموو شارەکان ... چونکە شار نی‌یە دەیەها بەندیخانەی تێدا نەبێت .. یەکێك لەسەر دیوارێك نوسیبوی « رۆژی شومو ڕەش ئەو رۆژە بو کە خومەینی گەڕایەوە ئێران .... هەر لەو رۆژەدا نەگبەتی وەکو مێردەزمە سواری ملمان‌بوو .

پاش هاتنەوەی خومەینی بە ماوەیەکی کەم بەند کرام . رۆژی نیو کولێرە هەرزنم ئەدەنێ لەگەڵ کاسە کەلێك ئاودا . حەفتەی جارێکیش تەشپیەك شۆربا .. ئەو رۆژەی شۆربا دابەش بکرێت ئەوە جەژنمانە گەرچی شۆرباکەش پری خوێیە ... بەڵام پاسەوانی بەندیخانەکەمان رۆژ نی‌یە ( چلو کەبابی ) نەخوات بە قوزەلقورتی بێ .. بە ڕشانەوەی بێ لە خواری نووسینەکەیەوە نوسیبوی ... ناوم نەگبەتێکە .... » .

بەڵام یەکێکی کە لە خواری نوسینەکەی ئەوەوە نوسیبوی ( منیش نەگبەتێکی ترمو ئەلێم : لەو رۆژەی کە شۆربا دابەش ئەکرا ورگی نەگبەتی یەکەمیان هەڵدڕی بەڵام ریخۆڵەکانی وشکەوە ببونو گەدەی شۆربای تیا نەبو ...

زوخاوێکی زۆر لە ورگیا بوو لەگەڵ سونگی ئاخونەکانی خومەینیدا بەو ناوەدا تەشەنەی کرد ... ئەو رۆژە وتیان ئەمڕۆ شۆربا نی‌یە ...

زوخاوی ئەو نەگبەتەیان بە سەرمانا دابەش کرد ... ئای کلۆل بەیانی زوو لە خەو هەستا وتی ئەمڕۆ شۆربامان هەیە ...

شورباکەشی نەخوارد » منیش وتم ئەی باشە تۆ لەوێ چیت ئەکرد ...

کابرای ئاوین لێم مۆڕبوەوە بو خەریك‌بو بمخوا .. وتی قسەکەم پێ مەبڕە ... گوایە بلێی چیم ئەکرد .. ئەوەتا ورگم نوساوەتە پشتمەوە تەماشای‌کە ... ورگێ وا سیخن بێ چلو کەبابی پێوە دیارە .. هەڵبەتە منیش نەگبەتی سێیەم بومە پاشان کابرا هێدی بووەوە لەسەر خۆی وتی کاکە سوێندت بۆ ئەخۆم ( بە گۆڕی نەگبەتی یەکەمو دوهەم نازانم گوڕیشیان هەیە یانە ) پێش ئەوەی بخرێمە زیندانەوە هەستم بەوە کردووە کەوا لە پێستی خۆمدا بەند کراوم ... بەڵام بلێی کەی ئەم هەستەم کردبێ ئەوە لەو کاتەوەی کە نەحلەتیەکە گەڕایەوە .... بەڵام پێش ئەویش دەغەزاری دەستی شا بوین .. برا لێرەدا وەکو کورد وتەنی ئەڵێم رەحمەت لە کفن دز !! کورە رحمەت نە نەحلەت لە گوڕ بە گوڕەکەیش منیش لێم پرسی هاوەڵەکانت ماون ... ؟

– بڕوا ناکەم

– ئەی باشە چەن زیندان گەڕاوی ؟

– زۆر

– کەواتا گومانت لێ ئەکرێ ... چۆن هەتا ئێستا ماویت ؟

ـ براله حەقی خۆتە ( ئاخێکی قوولی هەڵکێشاو ) وتی : ( من وەکو گۆشتو گیان نەماوم ...

ئەوەتا پێستەکەم نوساوەتە ئێسکەکانمەوە دوو چوکولی رەقو تەقم ماوە من لە رۆخاوی نەگبەتی یەکەمو دوهەم دروست کراوم ... گەلێ بەندیخانە گەراوم هەمیشە نەگبەتی سێیەم بوومە .

ـ ئەی باشە بۆ نەگبەتی یەکەم یان دوهەم نەبویتە هەمیشە هەر سێیەم بویتە ... ئۆهو من چیمە بەم باسەوە بۆچ گومان لەم نەگبەتە ئەکەم ... ئەرێ نەگبەت گیان پرسیارێکی ترم هەیە تۆ گەلێ زیندان گەراویت چ شتێك سرنجی راکێشاویت ؟

ـ ئێوارەیەکی درەنگ پاسەوانی بەندیخانەکەمان بە چاو خەوتو بە دڵ وریا بو .. کابرا سورفشێك بو لوت خڕ ... گوناکانی سوریان بو هێزە مالی فەقیرو هەژاری خواردبو شەویلکەی ژێر چەنەی هاتبۆ خوارەوە ئەتوت مانگای ئابڵاخە . پاش تۆزی دەس کردە لرخەلرخ ئینجا ورینە ... بە دەم ورینەکەوە ( حەی ) ئەکرد بەڵام لە باتی حەی ئەڵلا ملی بەملاو بەولادا یا ئەداو ئەیوت ( تومەن ... تومەن ... تومەن ) لەوەو پێش کابرام ئەناسی لە ( باخی وەحش ) پاسەوان بوو ئەو خوا نە ناسە لە خواردنی ئەو بێ زمانانەیشی ئەگرتەوەو ئەیدزیو ئەیفرۆشت ... لەسەر ئەو دزێتیە لەوێ دەریان کرد هێنایانە ئێرە ... نەك لەبەر ئەوەی کە دزی کردووە لەبەر ئەوەی لێرە باشتر دزیو قری بکاتو بەشی ئەوانی تریش بدات .. کابرا چەندەی هەبێت بەشتا هەر ورینە ئەکاو خەو بە پارەو بە ( تومەن )ەوە ئەبینێت .

ـ دیارە ئەو پاسەوانە نوێنەری رژێمی گەورەی ئاخونەکان بووە .

ـ هەڵبەتە .

ـ باشە ئیتر لەسەر دیواری بەندیخانەکان چیتر نوسرابو ؟ ...

ببورە شەکەتو بێهێزی ... منیش گەلێکم پرسیار کرد ... زۆر وتنی قورئان خۆشە جارێکی کە پرسیارت لێ ئەکەم .. بەس ئەڵێم کەس بەر نەئەبو ... هەموو هەر بەند بوون ؟ ..

کابرای نەگبەت دایە قاقای پێکەنینو وتی پرسیارەکەت سەیرە ... برا ئێران بوەتە بەندیخانەیەکی گەورە . لە کوێدا بژیت هەر بەندیخانەیە .... ئەو شۆربایەی کە حەفتەی جارێك دابەش ئەکرا ئێستا ئەوەیش دەس ناکەویت .. لە ئێراندا بەس مردن دەس ئەکەوێت .. ئەشەتەن بیلان ئەگەر داوای هەر شتێکی تریش بکەیت ئەوە « نیست واتەنیە »ت دەس ئەکەویت .



# هەنگاوێکی تر بۆ ساغکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی

○ کەریم شارەزا ○

**لە ژمارە (٦٦)ی گۆڤاری « بەیان »دا لێکۆڵینەوەیێکی مامۆستا ( محەممەد عەلی قەرەداغی )م بە ناونیشانی « هەنگاوێك بۆ ڕاست کردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی » بە وردی خوێندەوەو ، تا ڕادەیێکی باش تێنوەتی تاسەو ئارەزووی ساغ کردنەوەی شیعرەکانی حاجی لەلا شکاندمو دەرکایەکی فرەوانی لە بەردەم نووسەرو لێدوێنەرەوەی ئەدەبی کوردی کردەوە ، تا بە دوای ڕاست کردنەوەی شیعرەکانی ئەو ئەلە شاعیرە نەتەوەییەماندا بگەڕێنو بە ڕاستو دروستی دەقی شیعرەکانی بخەنە بەر دەستی نووسەرو شیعر دۆستانی گەلی کورد .**

ئەو هەنگاوەی مامۆستا قەرەداغی کە بۆ ڕاستکردنەوەی شیعرەکانی حاجی قادر هاویشتویەتی لە ڕێگەی بەراوردکردنی دوا چاپی دیوانەکەیەتی لەگەڵ چەند پارچە شیعرێکی ناو دەفتەرە دەسخەتەکانی خوا لێخۆشبوو ( مستەفا صائیب )داو ، دەست نیشانکردنی دەقی ناڕاستو شێوێنراوی ناو دیوانە چاپکراوەکەیو بڵاوکردنەوەی دەقە ڕاستەکانی ئەو پارچە شیعرانەی حاجی بە پێی مەنتیقو ماناو واقیعی زمانی ئەدەبیی ئەوسای شاعیر کە لەدوا دوای سەدەی نۆزدەهەمدا کۆچی دوایی کردووە ، لەو کارەشیدا پشتی بە دەفتەرە دەسخەتەکانی ( م. صائیب ) بەستووە کە دوور لە شێواندن لە ١٩٢١/٢/١٥ دا تۆماری کردوون .

ئەم لێکۆڵینەوەو بەدوا داچوونەی منیش هەر بۆ ئەوەیە خۆشم هەنگاوێکی تری بە دوا دا بنێمو بەشدارێکی بچووك لە پرۆژەی ساغ کردنەوەی هەندێ لە شیعرەکانی حاجیدا بکەم ، لەم کارەشمدا پشت بە هەڵسەنگاندنو بەراوردکردنی هەندێ لە شیعرە چاپکراوەکانی لە چەند سەرچاوەیێکی ئەدەبیو ڕۆشنبیریی جیاوازەوە دەبەستم ، لەوانە :ـ

**أ ـ چاپی سێیەمی دیوانەکەی حاجی قادری کۆیی ، چاپو بڵاوکردنەوەی گیوی موکریانی(١)و ، بۆ کورت کردنەوە پیتی « گ »ی لە جیاتی بەکاردێنین .**

**ب ـ کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ، چاپو بڵاوکردنەوەی عەبدوڕەحمان سەعید(٢)و ، پیتی (ع) لە جیاتی بەکار دێنین .**

**ج ـ چەند پارچە شیعرێکی بڵاوکراوەی ناو [ ڕوژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی ](٣)و ، پیتی « ت »ی لە جیاتی بەکار دێنین .**

**د ـ چەند پارچە شیعرێکی بڵاوکراوەی حاجی لە گۆڤاری « ڕۆژی کورد »(٤)و پیتی « ر »ی بۆ بەکار دێنین .**

**هـ ـ پارچە شیعرێکی بڵاوکراوەی ناو ژمارە (٣)ی ڕوژنامەی « کوردستان »(٥)و ، پیتی ( ك ) بۆ دەکەین بە نیشانە .**

تاکو لە ئەنجامدا بە پێی لێکدانەوەو بۆ چوونی خۆمو بەپێو زمانی ئەدەبیی ئەو سەردەمەی کە حاجی شیعری پێنووسیوەو ، پەسەند کردنی سەرچاوەی کۆنتری دوور لە شێواندن بە سەر سەرچاوی نوێدا ، ئینجا دەقی ڕاستو دوور لە هەڵەو شێواندن لە دەقی هەڵەو ناڕاست جیا بکەمەوەو ، بیخەمە بەردەستی ئەو نووسەرو ڕەخنەگرانەی شەیدای شاعیریەتی حاجیو ساغکردنەوەی شیعرەکانین .

١ – له هۆنراوەکەی « ئەگەر کوردیك »دا ، دێڕە شیعرێکی له سەرچاوەی یەکەم دووەمدا بەم جۆرە هاتووە :

**ئەمانە پاکیان کوردن نهایەت**
**لەبەر بێ دەفتەری [ ون بوون ]و فانی**
[ گ : ٧١ ، ع : ٣٨ ]

کەچی دەبینین نیوە دێڕی دووەم له سەرچاوەی سێیەم‌و چوارەمدا لەجیاتی « ون بوون » ، وشەی « نووسینە » نووسراوەو ، بەم جۆرەی خوارەوەیە :

**ئەمانە پاکیان کوردن نیهایەت**
**لەبەر بێ دەفتەری‌و ( نووسینە ) فانی**
[ ت : ١٧٨ ، ر : ٨٠ ]

نیوە دێڕی دووەم بەم دەقەی ئێستای لەگەڵ زمانی شیعریی حاجی‌دا باشتر ڕێك دەکەوێ‌و مەبەستی ئەوەیە بڵێ :

« ئەو کوردە ناودارانە لەبەر بێ دەفتەری‌و نەنووسینی ناوو کردەوەیان ، ناوبانگیان لەناو چووە » . من لەو باوەڕەدام ئەم دێڕە شیعرە وەکو ئەم دەقەی دووەم گوترابێ‌و کۆکەرەوەی کۆمەڵە شیعرەکەی حاجی خوالێ خۆش بوو عەبدوڕەحمان سەعید لە کاتی نووسینەوە کردبێتی بە ( ون بوون )و دوا بە دوای ئەویش گیوی موکریانی هەر بەو جۆرەی لێ وەرگرتبێ .

★ دێڕە شیعرێکی دیکەی حاجی ، له سەرچاوە نوێیەکاندا بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :

**کتێب‌و دەفتەرو تەئریخ‌و کاغەز**
**بە کوردی گەر بنووسرایە ( زمانێ ) !**
[ گ : ٧١ ]

ئەگەر له سەروای پارچە هۆنراوەکە ورد ببینەوە ، دەبینین هەموویان کۆتاییان بە (ی)ی درێژ دێ‌و هیچێکیان بە (ێ)ی کراوە نایێ ، کەچی لێرەدا بووە بە ( زەمانێ ) کە مەبەستی مامۆستا ( گیو ) لە ( زەمانێك )ە ، ڕاستییەکەیشی بە پێی مانای شیعرەکە ( زمانی )یە نەك ( زەمانێ )یە ، چونکە مەبەستی شاعیر ئەوە بووە بڵێ : « ئەگەر کتێب‌و دەفتەرو تەئریخ‌و کاغەزمان بە زمانی کوردی نووسرابان !! » .

ئەم هەڵەیە تەنها لە چاپی سێیەمی دیوانەکەیدا بەم جۆرەی خستمانە ڕوو هاتووە ، با سەرنجێکیش بدەینە دەقی ئەم نیوە دێڕە شیعرە لە سەرچاوەکانی دیکەدا تا بزانین چۆن هاتووە ؟

**بە کوردی گەر بنووسرایە زمانی**
[ ع : ٣٨ ]

**بە کوردی گەر بنووسرایە زوبانی**
[ ت : ١٧٨ ]

**بە کوردی گەر بنووسرایە زمانی**
[ ر : ٨٠ ]

دەبینین لە هەموو سەرچاوەکاندا یان ( زمانی ) یاخود [ زوبانی ، زبانی ] نووسراوە ، لەبەر ئەوەی دوو سەرچاوەکەی دوایی کۆنترن‌و لەسەردەمی حاجی قادریش لەسەر شێوەی فارسی وشەی ( زبان ، زوبان ) پتر بەکارهاتووە لە ( زمان ) بۆیە دەقەکانی « تێگەیشتنی ڕاستی »و « ڕۆژی کورد » ڕاسترن .

★ لە هەمان هۆنراوەدا ، دێڕە شیعرێکی تری لە دوو سەرچاوە نوێیەکە بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :

**هەر ( کوردن ) ئەگەرچی پاکی مەردن**
**پامالی زەمانە ( مەحوی کردن )**
[ گ : ٩٦ ، ع : ١١ ]

هەر ئەم دێڕە شیعرە لە تێگەیشتنی ڕاستی‌دا بە جۆرێکی‌تر نووسراوەو ، وشەی « کوردن » بووە بە « کوردان »و ، لە نیوەی دێڕەمیشی « مەحوی کردن » بووە بە « قەتلی کردن »و بەم جۆرە هاتووە :

**هەر ( کوردان ) ئەگەرچی پاکی مەردن**
**پامالی زەمانە ( قەتلی کردن )**
[ ت : ١٨٨ ]

وە لە گۆڤاری « ڕۆژی کورد »یشدا بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :

**هەر ( کوردن ) ئەگەرچی پاکی مەردن**
**پامالی زەمانە (( متلی کردن ))**
[ ر : ٧٨ ]

دەبینین لە نیوە دێڕی یەکەمدا وشەی ◁

« کوردن » لە سێ سەرچاوەدا هاتووەو ، لە نیوەی دووەمیش لەم دەقەدا بووە بە ( متلی کردن ) دیارە ئەمەش هەڵەیەو دوو نوختەی سەر قافەکەی نەماوەو ، راستیەکەی ( قتلی کردن = قەتلی کردن )ە ، جا بۆیە دەڵێم حاجی لە کاتی خۆیدا نیوە دێڕی یەکەمی بەم جۆرە گوتووە :

**هەر ( کوردن ) ئەگەرچی پاکی مەردن**

چونکە ووشە « کوردن » باشتر لەگەڵ کێشی شیعرەکە رێکدەکەوێ لە چاو « کوردان »و لە سێ سەرچاوەی کۆنو نوێوە بەم جۆرە هاتوە .

وە نیوە دێڕی دووەمیش لە دوو سەرچاوەی کۆندا بە ( قەتلی کردن ) هاتووەو ، فرمانی « مەحوی کردن » دوو جۆرە خوێندنەوە هەڵدەگرێ ئەگەر واوی ( مەحوو ) بە جووت واوو بەدرێژی بخوێنرێتەوە کێشەکەی تێکدەچێو ئەگەر بە یەك واوی کورتیش بخوێنرێتەوە وەك نازناوی ( مەحوی ) شاعیر ئەوا کێشەکەی راست دەبێتەوە ، جا بۆیە دەڵێم « قەتلی کردن »ەکە راستترە بۆ شیعرەکەو ، یەکجۆرە خوێندنەوە هەڵدەگرێو ، لە سەرچاوەی کۆنتر بەو جۆرە هاتووە .

★ هەر لەم هۆنراوەیەدا ، دێڕە شیعرێکی تری لە سێ سەرچاوەی کۆنو نوێدا بەم جۆرە هاتووە :

**گەر باعیسی ( ئەم ) دەپرسی کامە ؟**
**شەرتێکە کە بۆ هەموو تەمامە !**

[ گ : ٩٦ ، ع : ١١ ، ر : ٧٨ ]

کەچی تەنیا لە سەرچاوەی « تێگەیشتنی راستی »دا ووشەی « ئەم » بووە بە « ئەمە »و بەم گۆڕانەش کێشی شیعرەکە بڕگەیێکی زیاد کردووەو پێی لەنگبووەو ، بەم جۆرە نووسراوە :

**گەر باعیسی « ئەمە » دەپرسی کامە**
**شەرتێکە کە بۆ هەموو تەمامە**

[ ت : ١٨٨ ]

لێرەدا بە ئاشکرایی بۆمان دەردەکەوێ کە دەقی پێشوو تەواوەو ئەمەی دوایی ناتەواوو لەنگە .

★ دوا بە دوای ئەم دێڕە شیعرە تاکێکی دیکە دێتو ئەوەی مایەی دڵخۆشیمانە ئەوەیە لە هەرچوار سەرچاوەکە وەکو یەك هاتووەو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووەو بەم جۆرەیە :

**ئەو شەرتە بە کوللی ئیتیفاقە ،**
**گەر مەرعەشو وانە گەر عیراقە .**

[ گ : ٩٦ ، ع : ١١ ، ت:١٨٨ ، ر : ٧٨ ]

★ دوای ئەم دێڕە شیعرەش تاکێکی دیکە بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :

**صەد شێخو مەلاو ئەمیرو خانی**
**بۆ لەززەتی ( عەیشو زینەگانی )**

[ گ : ٩٦ ، ع : ١١ ]

کەچی دەبینین لە سەرچاوەکانی تێگەیشتنی راستیو رۆژی کورد دا نیوە دێڕی دووەمی بەم جۆرە نووسراوە :

**بۆ لەززەتی ( عەیشی زیندەگانی )**

بە کەمێك ووردبوونەوە لە مانای شیعرەکە بۆمان روون دەبێتەوە کە دەقی دووەمین راسترە، چونکە مەبەستی لە ( عەیشی زیندەگانی ) ژیانی زیندووەتی ئادەمیزادە ، واتا : ژیانی سەر دنیای.

حاجیش مەبەستی لە شیعرەکەی ئەم مانایە بووە .

★ دێڕێکی دیکەی ئەم هۆنراوەیەی حاجی لە سێ سەرچاوەی کۆنو نوێدا بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :

**لەو لاوە ئەوان بە ( حیلە سازی )**
**لەم لاوە ئەمان بە تەقلە بازی**

[ گ : ٩٦ ، ع : ١١ ، ر : ٧٨ ]

کەچی تەنها لە سەرچاوەی تێگەیشتنی راستیدا لە جیاتی ( حیلە سازی ) بووە بە ( حیلە بازی )و بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :

**لەو لاوە ئەوان بە ( حیلە سازی )**
**لەم لاوە ئەمان بە تەقلە بازی**

[ ت : ١٨٩ ]

هەرچەندە ( حیلە بازی ) راســــتترە لــە ( حیلە ســــازی )و بــەرامبــەر بە ( فێڵبازی ) دەوەستێ . بەڵام مەبەستی حاجی لە بەکارهێنانی ( حیلە سازی ) ئەوە بووە تا لە یاساو دەستووری سەروای شــــیعر لانەداو ، مادامکی لە نیوەی دووەمدا ( بازی ) کردووە بە سەروا ، ئەوا دەبێ ســـەروای نیوەی یەکەم ( بازی ) نەبێ ، بۆیــە ( سازی ) بەکار هێناوەو ســـازکردنیش ، رێك خستن‌و دروســـتکردن دەگرێتەوە ، جا لــەبــەر ئەوە ، دەقی یەکەم لە بارەی هونەری شـــیعری کلاسیکیەوە تەواوترە لەهی دووەم .

**٢ ـ حاجی ســــەرەتای هۆنراوەیەکی بە عەرەبی دەســــتپێکردووە ، لە چاپی سێیەمی دیوانەکەی نەبێ کــە بــەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :**

**ســـــــەلام الله عەلــەیکوم کــل یوم**
**لــە ئەصحابانی صاحیب غیرەت‌و دین**
[ گ : ١١٣ ]

دەنا لــە هەموو ســــەرچاوە کۆنەکاندا بــەم جۆرەی خوارەوەی نووسراوە :

**( ســــــلام الله مني کـــل یـوم )**
**لــە ئەصحابانی صاحیب غیرەت‌و دین**
[ ع : ٥٥ ، ت : ١٩١ ، ر : ٧٨ ]

بە کەمێك وورد بوونەوە لـــە مانای دێڕە شیعرەکە دەبینین ئەو دەقەی « گ » شێوێنراوەو دەقی دووەم لە هەموو بارێکەوە راستترە چونکە مەبەستی حاجی لە شیعرەکەیدا ئەوەیەو دەڵێ :

**« هەموو رۆژێ سـلاوی خوای لە منەوە**
**لە دۆستە خاوەن غیرەت‌و ئاینەکان بێ »**

کەچی لە دەقی یەکەمدا کە بڵێ :

**« هەموو رۆژێ سـلاوی خواتان لێ بێ »**

دەبوایە لە دێڕی دووەمی شیعرەکەشدا بڵێ :

**« لە ئێوەی دۆستی خاوەن غیرەت‌و دین »**

ئەمە لە بارەی ماناوە ، لە بارەی کێشـــــی شــــیعرەکەشەوە ، دەقی دووەم کێشی هــەردوو نیوەکەی ١١ بڕگەیە ، کەچی لە دەقی یەکــەمـدا نیوە دێڕی یەکەم بووە بە ١٢ بڕگە وە کێشەکەی بێ لەنگ‌و لاسەنگ بووە .

★ دوا بە دوای ئەم سەرەتایە دێڕە شیعرێکی بەم جۆرەی خوارەوە لە سێ ســـەرچاوەی جیاوازدا هاتووەو دەڵێ :

**لە بەر دووری لــە ئەقران‌و لە ئەمثال**
**لە کوردانم دەپرسی ضەربولئەمثال !**
[ گ : ١١٣ ، ع : ٥٥ ت : ١٩١ ]

تەنیا لە دەقی ( رۆژی کورد )دا نیوە دێڕی یەکەم بەم جۆرە نووسراوە :

**لەبــەر دووری لــە ئەقران‌و ئەمثال**
[ ر : ٧٨ ]

دەبینین ئامرازی ( لە ) لە پێش ( ئەمثال ) لادراوەو بەمەش کێشـــەکەی بڕگەیێکی لە کورتی داوە ، بۆیە دەڵێم دەقی یەکەم راستە .

دێـــڕێکی دیـکەی هۆنراوەکــە لـــە ســـێ سەرچاوەدا بەم جۆرە هاتووە :

**دەفەرمووی ئەم عەزابە ( بۆچ ) دەکێشی**
**چ مەظلوومــە ئەگــەر چاوت نــەیێشی ؟**
[ گ : ١١٣ ، ع : ٥٥ ، ت : ١٩١ ]

تەنیا لە ( رۆژی کورد )دا وشەی بۆچ درێژ کراوەتەوەو کراوە بە ( بۆچی )و بەم کارەش کێشی نیوە دێڕەکە بڕگەیێکی زیاد کردووەو لەنگ‌بووەو بەم جۆرە نووسراوە :

**دەفەرمووی ئەم عەزابە ( بۆچی ) دەکێشی**
[ ر : ٧٥ ]

★ دێڕە شــــیعرێکی تری ئەم هۆنراوەیە لـــە سەرچاوەی یەکەم‌و دووەمدا لە هەر جێیە بە جۆرێك نووسراوە ، لــە یەکەمیاندا بــەم جۆرە هاتووە :

**ئەگەر وەك من ( خەبەردار بن ) لە دەوڵەت**
**لــە حەیفــان ( خۆ دەخنکێنن ) بە بێ پەت**
[ گ : ١١٣ ]

لێرەدا رووی ئاخاوتنی حاجی لــە ( کەسی دووەمی کۆ )یە ، کەچی لە سەرچاوەی دووەمدا نیوە دێڕی یەکەم بۆ ( کەسی دووەمی کۆ )یەو لە نیوە دێڕی دووەمــدا رووی ئاخاوتنەکــەی لــە

( کـەسی دووەمی تـاك ) دەکـات بـەم جـۆرە نووسراوە :

**ئەگەر وەك من ( خەبەردار بن ) لە دەولەت**
**لە حەیفـان ( خۆت دەخنكێنی ) بە بێ پەت**
( ع : ٥٥ )

کەچی لە سەرچاوەی سێیەم‌و چوارەمدا لە هەردوو نیوە دێڕدا رووی ئاخـاوتن لـە کـەسی دووەمی تاکە ، بەم جۆرە نووسراوە :

**ئەگەر وەك من ( خەبەردار بی ) لە دەولەت**
**لـە حەیفـان ( خۆت دەخنكێنی ) بەبێ پەت**
[ ت : ١٩٢ ، ر : ٧٩ ]

بە کەمێك وورد بوونەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم دەقەی دوایی لە هەموان راسترە ، چونکە لەهی یەکەم هەرچەندە هەردوو نیوە دێڕەکـە بۆ ( کەسی دووەمی کۆ )یە ، بەلام حاجی قەت نـەی گوتووە ( خۆ دەخنكێنن ) چونکە زمانی شـیعری وانەبووە ، ئەگـەر ویـستبای وابلێ دەیگوت [ خۆتان دەخنكێنن ] لەم بارەشدا کێشەکەی لەنگ دەبێ ، دەقی دووەمیش هـەر دێڕەی بۆ جـۆرە کەسێکە ئەمەش نابێ ، بۆیە تەنیا دەقی سـێیەم وەك گوتمان هەردوو نیوەکـەی بەرامبـەرن‌و بـۆ کەسی دووەمی تاکن‌و راست‌و تەواوە .

★ حاجی لە دێڕە شیعریکی هەمان هۆنراوەدا باسی ژمـارەی کورد دەکـات ، بەلام ئەوەی مایەی سەرنج ڕاکێشانە ، لـە سەرچاوەی یەکـەمـدا باسی نفووسی کوردەو ژمـارەیان دەگەێنیتە (١٢) ملیۆن کەس‌و دەلێ :

**دوازدە ملیۆنـە کـورد نفووسـی**
**بە قسەی ئەهلی تەخمینێ کـە نووسی**
[ گ : ١١٣ ]

لە سـەرچاوەی دووەمیشدا ( کورد )ە کـە دەبێت بە ( کوردستان )و نفووسەکەشی هەر بـە (١٢) ملیۆنی دەمینێتەوەو بەم جۆرەیە :

**دوازدە ملیۆنـە کـورد نفووسـی**
**بە قسەی ئەهلی تەخمینێ کـە نووسی**
[ ع : ٥٦ ]

دەبینین لـە دەقی یـەکـەم کـە ( کورد ) بەکارهاتووە کێشی شیعرەکە لـە دە برگەیی‌یەوە دەبێت بە (٩) برگەیی‌و لە دەقی دووەمیشـدا کە دەبێت بە « کوردستـان » دەبینین برگەیێك زیاد دەکات‌و دەبێت بە « ١١ » برگەیی . بەلام لە سـەرچاوەکانی سێیەم‌و چوارەمدا دەبینین ( دوازدە ) ملیۆنـەکـە ( چـوار ملیـۆنـە )ە و کوردستانیش لە شوێنی خۆی ماوەتەوەو کێشی شیعرەکەش راسـتبۆتەوەو بووە بە (١٠) برگەیی‌و ئەم دەقەیان لە هەموویان راسترە کـە دەلێ :

**چوار ملیۆنـە کوردسـتانْ نفووسی**
**بـە قسـەی ئەهلی تەحمینی کەنووسی**
[ ت : ١٩٢ ، ر : ٧٩ ]

دەمینێتەوە ژمـارەی ملیۆنەکـەی نفووسی کوردسـتان ئایا دوازدەیە یا چوارە ؟! هەروەك حاجی گوتوویەتی : « ئەهـلی تەخمین بـەچـوار ملیۆنیان نووسیوە » چونکە ئەوسا هەموو سـەر ژمێرییەك هـەر بە تەخمین بـووە ، تـەنـانـەت دەولەتی عوسمانلیش سەرژمێری دانیشـتوانی نەکراوە ، ئەوەی راستیش بێ ژمارەی دانیشتوانی ئێستای هەر وولاتێك لە چاو ژمارەی دانیشتوانی سەدەی نۆزدەهەمی کـە حاجی شیعرەکەی تێـدا گوتووە ، یەك‌و سێ‌و یەك‌و چوار زیادی کردووەو نفووسی کوردستانیش هەلبەت بەو پێی زیـادی کردووە .

★ هەر لەو هۆنراوەیەدا ، دێڕە شیعرێکی لـە چاپی سێیەمی دیوانەکەیدا نەبێ دەنا لـە هەرسێ سـەرچاوەکەی‌تر بەم جۆرە نووسراوە :

**لە گوێی گا نووستون هەرچەندە شێرن**
**وەکوو کەروێشکی چاو ( ئازا )و کوێرن**
[ ع : ٥٦ ، ت : ١٩٢ ، ر : ٧٩ ]

لە چاپی سێیەمی دیوانەکەشی نیوە دێـری دووەمی بەم جۆرە نووسراوە :

**وەکو کەروێشکی چاو ( راماو )و کوێرن**
[ گ : ١١٤ ]

هەرچەندە ( چاو ڕاماو ) ماناکەی ئاشکراترە

لــە چــاو ( چاو ئــازا ) بــەڵام چونکە لە کونترین ســەرچاوەوە تــا دەگاتە کۆمەڵەی عەبدورەحمان ســــــەعید هەر بە ( چاو ئازا ) هاتووە ، بۆیە وا راستترە ئەو دەقەی پێشوو پشتی پێ ببەسترێ‌و، دیارە مەبەستی حاجی لە چاو ئازا ( چاوزەق ) بێ کەروێشـــــکە ، کە هەردەم زەقو گەورەیە کەچی زوو دەچێتە خەوەوەو وەکو کوێربێ وایە .

★ دێرە شیعرێکی تری هــەر ئەم هۆنراوەیەی لە ســـــەرچاوەی چاپی سێیەمی دیوانەکەی نەبێ دەنا لــە سێ سەرچاوەکەی دیکە بــەم جۆرە هاتووەو یەکن :

**ئەمانــە بێ شـــــــوورو گێژو وێژن**
**موطیعی ( لۆتــە خۆر )و هــەرزە بێژن**

[ ع : ٥٦ ، ت : ١٩٣ ، ر : ٧٩ ]

نیوەی دووەمی شیعرەکە لە چاپی سێیەمی دیوانەکەیشی بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە :

**موطیعی ( موفتە خۆر )و هەرزە بێژن**

[ گ : ١١٤ ]

هەروەك بۆمان دەرکەوت جیاوازی لە نێوانی دوو دەقەکەدا لــە ووشـــــــەی « لۆتە خۆر »و « مفتە خۆر » دایە ، لۆتە خۆر : پیاوی پاشماوە خۆرەو ( مفتە خۆر )یش کەسێکە کە بە شـــوێن شـــتی خۆراییدا بگەرێ ، هەرچەندە هــەردوو ووشـــەکە لەگەڵ ماناو مەبەســـتی شیعرەکەدا دەگونجێن ، بەڵام چونکە « لۆتە خۆر »ەکە لـــە سەرچاوەی کۆنترەوە هاتووەو ، لــە مەڵبــەنــدی سەرەتای ژیانی حاجی کــە شـــــــاری کۆیەیە بەکار هاتووەو گوتراوە ئەو کەسە « لۆتەو پۆتــە خۆرە » یاخود « چڵکاو خۆرە » واتا پیاوی بەگ‌و ئاغاو سەردارە .

★ دێرێکی تری ئــەم هۆنــراوەیــە لــە هـــەر سەرچاوەیە بە جۆرێك هاتووە لێرەدا هــەر چواریان دەخەینەروو :

**(١) :**

**( کورێکی ) وا ( نییە ) هەستێتە سەر پێ**
**بزانێ خەڵکی چۆن کەوتوونە ســـەر پێ**

[ گ : ١١٤ ]

لەم دەقەدا ســەروای یەکەم‌و دووەم یەکن‌و هەردووکیان یەك مانا دەدەن بە دەستەوە ، دەنــا دەمان گوت بۆ جوانکاری‌و جیناس بەکار هاتوون :

**(٢) :**

**( کورێکی ) وا ( نییە ) هەســــتێتە سەر پێ**
**بزانێ ( چۆن هەر کەس ) کەوتە ( سەر ڕێ )**

[ ع : ٥٦ ]

لێرەدا دەبینین سەرواکان بوون بە ( پێ ) و ( ڕێ ) ئەمەش راست‌و دروستە ، بەڵام نیــوەی دووەمی شیعرەکە گۆڕانێکی زۆری بەسەرداهات.

**(٣) :**

**( کەســێکی ) وا ( نەبوو ) هەستێتە سەر پێ**
**بزانێ ( چۆن هەموو کەس ) کەوتە سەر پێ**

[ ت : ١٩٤ ]

ئەمجارە دەبینین لــە نیوە دێڕی یەکەمــدا « کورێکی » بووە بە « کەســـێکی »و ، ( نییە ) بووە بە ( نەبوو )و لەنیوە دێڕی دووەمیش لەجیاتی ( هەرکەس ) ، ( هەموو کەس ) بەکارهاتووە .

**(٤) :**

**( کورێکی ) وا ( نەبوو ) هەســـتێتە سەر پێ**
**بزانێ ( چۆن هەر کەس ) کەوتــە سەر ڕێ**

[ ر : ٧٩ ]

**لە نیوە دێڕی یەکەمدا ووشەی ( کەسێکی ) بووە بە ( کورێکی ) وەکو دەقەکانی یەکەم‌و دووەم هــاتووە ، نیوە دێڕی دووەمیش لــە چــاو دەقی سێیەم گەلێ راستترە چونکە بۆ ووشـــــەی کەس ( هەر ) بەکار هاتووەو کــە گوترا ( هــەر کەس ) دەگوترێ ( کەوتە سەر ڕێ ) بەڵام ئەگەر وەك دەقی سێیەم گوترا ( هــەموو کــەس ) دەبێ فرمـــانی ( کەوتە ) بکرێت بە ( کەوتنە ) چونکە هەموو کەس بۆ کۆیە .**

دوای بەراوردکردنی هەر چوار دەقەکە وا باشە راسترینیان دەست نیشان بکەین‌و لە پێش هەموو شتێکدا ووشەی ( کورێکی ) کە لە سەرەتای دێرە شیعرەکەدا هاتووە بە راست دابنێین چونکە لە کۆنترین سەرچاوەوە تــا نوێترینی هـــەر بــە

(کورێکی) هاتووە تەنیا لە ( تێگەیشتنی راستی )دا نەبێ بە ( کەسێکی ) هاتووە .

لە دوای ئەو ووشەیە ( وا نی‌یە ) لە دەقی یەکەم‌و دووەمدا بەکار هاتووەو ( وا نەبوو )ش لە دەقی سێیەم‌و چوارەمدا هاتووە ، چونکە لە سەرچاوە کۆنەکاندا وا هاتووەو بۆ رووداوی رابوردوو بەکارهاتووە کە حاجی مەبەستی بووە ، بۆیە ( وا نەبوو ) بەراستتر دەنانینین وە بەپێی ساغ کردنەوەی دەقی چوارەمیش کە لە خالی چوارەمدا دەرمان بڕی ئەم دەقەی خوارەوە لە هەموویان راستو دروستترە .

**کوڕێکی وا نەبوو هەستێتە سەر پێ**
**بزانێ چۆن هەر کەس کەوتە سەر ڕێ**

★ هەر لەم هۆنراوەیەدا دەقی دێرە شیعرێکی دیکەی لە دوا چاپی دیوانەکەی نەبێ دەنا لە هەر سێ سەرچاوەکەی تر وەکو یەکن‌و بەم جۆرەیە :

**ئەگەر کارێک نەکەن لەم بەینەدا زوو**
**( مەمالیك ) کاتێکی زانیت لەدەس چوو**
[ ع : ٥٦ ، ت : ١٩٤ ، ر : ٧٩ ]

کەچی دەبینین لە دوا چاپی دیوانەکەیدا ووشەی ( مەمالیك ) کراوە بە ( ووڵات )و بەم جۆرەی خوارەوە نووسراوە :

**ئەگەر کارێك نەکەن لەم بەینەدا زوو**
**( ووڵات ) کاتێکی زانیت لەدەس چوو**
[ گ : ١١٤ ]

وا دیارە بەخشکاری دیوانەکەی حاجی وای لا پەسەندبووە ووشەی ( مەمالیك ) کە عەرەبی‌یەو کۆکراوەی ( مەملەکەت )ە و ، بە مانای ئەو ووڵاتە دێ مەلیك حوکمڕانی بکات ، بیکات بە کوردی‌و ووشەی ( ووڵات )ی لە شوێن دابنێ کارێکی باش دەکات !!

لە سەرێکی تریشەوە کە ووشەی « ووڵات »ی دووبڕگەیی لە جێی « مەمالیك »ی سێ بڕگەیی داناوە ، هەستی کردووە بڕگەیێکی لە کورتی داوە بۆیە کردوویەتی بە « ووڵاتت » و « ت »ی راناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی پێوە نووساندووەو لە هەمان کاتیشدا ئەو ڕاناوە بە فرمانی رابوردووی « زانیت »ەوە لکێنراوە ، ئەمەش لە بارەی رێزمانی کوردی‌یەوە نابێو ، لە دەقە کۆنەکەدا تەنیا « ت » بە فرمانەکەوە لکێنراوەو ( مەمالیك ) بە بێ راناو نووسراوە ، کە ئەم دەقەیان زۆر راستو ڕەوانە . .

★ هەر لەو هۆنراوەدا ، دێرە شیعرێکی تر هاتووەو لە سێ سەرچاوەدا وەکو یەك نووسراوەو بەم جۆرەیە :

**گەمی صەحراوو دەریا دێتە جولان**
**بە غەیری ( پێکەوە ) فەوجی سواران**
[ گ : ١١٥ ، ع : ٥٦ ، ت ١٩٤ ]

لە دەقی دوا چاپی دیوانەکەی نەبێ ووشەی ( جولان ) بە ( جوولان ) نووسراوە ، دەنا لە دەقەکانی تردا ( جَولان ) بە تەنیا یەك ( واو ) نووسراوە ، ئەمەش بە رێنووسی کۆنە ، کاتێك کە بە رینووسی نوێی بنووسین دەبێت بە ( جەولان ) چونکە مەبەستی شاعیر لە چاوگی ( جەولان ) هاتوچۆکردنە نەك بزووتنەوە . مەسەلەکەش لە سەر شەڕو جەنگەو دەڵێ : [ کاتێك گەمی « پاپۆڕ »ی دەریاو پاپۆڕی سەحرا کە دەبێ مەبەستی لە حوشترو ووڵاخ یاخود عارەبانەو شەمەندووفەری سەربازو تۆپو چەك هەڵگربووە ، دێنە هاتوچۆکردن بۆ شەڕو جەنگ ] ئینجا لە نیوەی دووەمی شیعرەکەدا دەڵێ : [ ئەمە جگە لە فەوجی شەڕکەری سوارە ] .

لە راستی‌دا ئەم نیوە دێرەی دووەم کە دەڵێ :

**بە غەیری ( پێکەوە ) فەوجی سواران**

نە دارشتنەکەی رێكو تەواوەو نە ماناکەشی روونو ئاشکرایە ، جا بۆ ساغ کردنەوەی راستی‌ی دارشتن‌و رێکی‌ی ماناکەی ، پەنا دەبەمە بەر دەقی هەرەکۆنی شیعرەکە کە لە [ روژی کورد ]دا بە رێنووسی کۆن بەم جۆرە نووسراوە :

**« بغیر پێکرە فەوجی سواران »**
[ ر : ٧٩ ]

کە ئەم دەقە دێنینە سەر رێنووسی ئەمرۆی زمانی کوردی بەم جۆرەی لێ‌دێ :

**بـه غەیری پێکوڕەی فەوجی سواران**

دەبینین ووشەی ( پێکەوە )ی دەقەکانی تر بوو بە ( پێکوڕە ) ، ( پێکوڕە )ش بە کولۆ ( کوللە ، کولە )ی سـاوا دەکوترێ کـە جاری بالیان لێ نەڕواوەو بە هەزاران هەزار هێرش دەبەنە سـەر زەرعاتو ڕووکو ، تەڕو ئیشـك بە یەکـەوە دەخۆنو لـە ناوی دەبەن . حاجی لـەم دێـڕە شیعرەیدا فەوجی سـوارانی دوژمن لە ژمارە زۆریدا بە فەوجی پێکوڕەی کوللە دەچوێنێ !!

**لێرەدا شـیعرەکە مانـایێکی روونو**

ڕەوانبێژیێکی جوانمان دەداتە دەست بۆیە دەڵێم ئـەم دەقەی ( ڕۆژی کـورد ) لـە هـەموویان ڕاستترە .

ئەگەر ئێمە لەو سـەرچاوانەوە بە دوای بەراوردکردنی دەقەکانی شیعری حاجیدا بکەوین، چاومان بە گەلێ جیاوازیو گۆڕانکاری نێوانیـان دەکەوێت ، بە ڕادەیێکی وا سەر لە لێکۆڵەرەوەی ئەدەبی کوردی دەشـێوێنێو ، ئەوەی زۆر بـە سەرنج تیژیەوە نەکەوێتە دوای ساغ کردنەوەی دەقەکان ، ناگاتە هیچ ئەنجامێکیوا کە بڵێ کارێکی بە سوودم لە مەیدانی ئەدەبی کوردیدا کردووە .

٣ ـ لەم گەشـتەی ناو سـەرچاوە چاپکراوەکانی شیعری حاجی قادر تەنیا چاومـان بە یەك نموونەی دڵخۆشکەر کـەوت ئەویش ئـەو پارچە هۆنراوەیەتی کە بۆ یەکـەم جار بە بۆنـەی کـۆچی دوایی لـە ژمـارە (٢)ی ڕۆژنـامـەی ( کوردستان )ی ساڵی ١٨٩٨ دا بڵاوکراوەتەوەو ، بـە ڕێنووسـی کۆن سـەرەتاکەی بـەم جۆرە نووسراوە :

**زمانـه رسـم جارانی نماوه**
**چراغ نـاظمو منشـی کژاوه**

[ ك : ژماره (٣) ، ل (٣) ]

دوا جـاریش لـە لاپـەڕە ( ٦٨ )ی چـاپی سێیەمی دیوانـەکـەیدا بـە ڕێنووسـی نوێ بڵاوکراوەتەوەو بەم جۆرە نووسراوە :

**زەمـانـە ڕەسمی جارانی نەماوە**
**چراغی نـاظمو مونشـی کوژاوە**

[ گ : ٦٨ ]

ئەوەی سەرنجمان رادەکێشی ئەوەیە ، بـە پێچەوانەی دەقەکانی دیکە ئەم پارچە هۆنراوەیە لە هەردوو سەرچاوەکاندا دەقاو دەق یـەکنو هیچ جیاوازیێکیان لە نێواندا نییە . خۆزگـە هەموو شیعرەکانی دیکەیشی ئاوا بێ هەڵەو دەسـت تێوەردان دەگەیشتنە دەست خوێندەواران .

خوێنەری بەڕێز ئەوەی بەرچاوت کـەوت هەنگاوێك بوو ، بۆ ڕاست کردنەوەی هەندێ لـە دەقی شـیعرەکانی حاجیو هـەر پشتمان بـە سەرچاوەی چاپکراوی ئەو شیعرانەی بەستو ، خۆ ئەگەر لە پاڵ ئەمانەوە ، کۆمەڵێك کەشکۆڵو دەفتەری دەسخەتی شیعرەکانی کە لەلای هەندێ ئەدەب پەروەران پارێزراون بخرێنە بەردەسـتی لێکۆڵەرەوەی شـیعری حاجی ، ئەوا دەبن بـە چاکترین سـەرچاوەی بـە نرخی پرۆژەی ڕاستکردنەوەی شـیعرەکانی بۆ ئەوەی لـە دیوانێکی ساغ کراوەدا چاپ بکرێنو بخرێنە بـەر دەستی خوێندەوارانی کوردمان .

—

**پەراوێزو سەرچاوەکان :**


١ ـ بڕوانە ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی ـ گردو کۆو پەخشـکاری گیوی موکریانی ـ چاپی سێیەمین ـ چاپخانەی هەولێر ، ١٩٦٩ .

٢ ـ بڕوانە « کومەڵە شـیعری حاجی قادری کۆیی » ـ چاپو بڵاوکردنەوەی عەبدوڕەحمان سەعید ، ١٩٢٥ .

٣ ـ بڕوانە « تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لـە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا » نووسـینی دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد ـ کۆڕی زانیـاری کورد ـ بەغدا ، ١٩٧٨ .

٤ ـ بڕوانـە « ڕوژی کـورد » ـ بڵاوکـردنەوەو پێشـەکیو لەسـەر نووسینی جەمال خەزنەدار ـ بەغدا ، ساڵی ١٩٨١ .

٥ ـ بڕوانە « کوردسـتان یەکەمین ڕوژنامـەی کـوردی ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢ » کـۆکـردنـەوەو پێشـەکی د. کەمال فوئاد ـ بەغدا ، ١٩٧٢ ، ژمارە (٣) ، لاپەڕە (٣) .

فیدریکو گارسیا لورکا :

# « دوانێك دەربارەی شانۆ »

دوکتور ئیحسان فوئاد
کردوویە بە کوردی



## ئەی برادەرانی خۆشەویست !

ماوەیەك لەمەوبەر بەڵینمدا کە بڕای بڕ بە ئاهەنگ‌و دانیشتنێ رازی نەبم کە بۆ رێزلێنان لە کەسایەتیی لاوازی من بســـازێنرێ ، چونکە یەکەم : لەو بڕوایەدام کـە هەر ئاهەنگێکی ئاوایی سەنگێ دەنێتە ســەر کۆڕی ئەدەبیمان دووەمیش لەبەر ئەوەی هیچ شـــتێك بەلای منەوە لــە خوێندنەوەی ووتارێکی رەســـمی زیاتر مایــەی دلتەنگی نییە کــە بــە شــانو باهۆی مەردومــا هەلبدرێت ، بەناوی رێزلێنانەوە ،هیچ شتێکیش زۆرتر لە چەپڵە لێــدانێکی رێــك‌وپێــك مایـــەی نائومێدی نییە ئەگەر چی ئەم چەپلە لێدانەشی بە نیــازێکی چاکــەوە لێبدرێت ! بــەڵــکو من لــەو بڕوایەشـــدام ئەمــەیش نــەهێنییەکە لای ئێــوە دەدرکێنم ـ کـە ئاهــەنگ‌و بــانگ‌کردن هێزێــکی تەلیســماوی هەیە کــە دەبێتــە مایــەی بەختێــکی خراپ بۆ ئەو کەسەی بۆی دەکرێت ، لەوانەیــە سەرچاوەی ئەم بێ بەختییەش لەوەوە هاتبێ کە دۆستانی ئەو کەسە رێز لێنراوە ، ئیتر دڵنیا دەبن لە خۆیان‌و دەڵێن « دووا جــار توانیمان ئــەرکی خۆمان بەرامبەری بەجێ بهێنین » .

بانگ‌کردن کۆبونــەوەیــەکــە : کــە کۆمەڵی خەڵکی خاوەن پیشـــە کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی بــە یەکەوە نان بخۆن ، بەڵام لە ناویانا خەڵکی وایش دەبینن کە لەو دەچێ کاروباری ئێمەیان هەر بـــە خەیاڵدا نەیەت .

خۆ ئەگەر ئەم جۆرە چالاکییانە بەدەســت من بوایە لە بریتی سازکردنی ئەم جۆرە ئاهەنگ‌و بانگ‌کردنانە بۆ بوێژو نووســـەرانی شانۆگەری ، کە بە ئازایەتییەوە ، تیایدا بووترایە « ئازابەو ئــەم کارە جێبەجێ بکە ! گرەوت لەگەڵدا دەکەم کە تۆ نــاتوانی ترسی یەکێ لــە پاڵەوانەکانت لــە دەریــا « بەســـەرکەوتوویی » دەربڕی ! گرەوت لەگەڵ دەکـــەم کـــە ئەوەندە چالاك بی بتوانی نائومێدی سەر:زێکی خۆت کە رقیان لە جەنگە بخەیتەروو ، یان بەسەرکەوتوویی وێنەی بکێشی » .

بە زۆر لایەنگری پێ‌کردن‌و ئەو خەباتەی پاڵ پێوەنەرەکەی خۆشەویستییەکی ســـــەخت‌و ڕاســـــتە ، دەبنە هۆی بەهێزبوونی ئارەزووی زاڵی هونەرمەند ، بــەڵام تــەواو بــە پێچەوانەوە

فشەو پیاهەڵدان ئەم بەهرەیە تێكدەداتو كزو لاوازی دەكات ! ( بەداخەوە ) شانۆكان پڕن لەو فریشتە ساختانەی دەریا كە سەریان ڕازاوەتەوە بە چەپكە گوڵێ پەروەردە كراوی خانوویەكی شوشە بەند ! كۆمەڵی سەیركەرانیش چەپڵە لێدەدەنو شادمانی خۆیان دەردەبڕن كە دڵێكی مومیائراو دەبینن ، یان گوێ یان لە گفتوگۆیەك دەبێ كە زۆر تر لە ورتە وورت دەچێت ! لە كاتێكدا بوێژی شانۆگەری ئەگەر بیەوێت خەڵكی لە بیرنەكەن ، نابێت هەرگیز میرگی گوڵە « كەشاوەكان » بەیانیان فەرامۆش بكات . كە ئاورەنگی « روونی » بەیانیان دایان دەپۆشی ، جووتیارەكانیش لەگەڵ هەڵهاتنی شەبەقدا كاری تیادا دەكەن ؟ بگرە نابێت ئەو كۆترەش فەرامۆش بكات كە گوللەی راوچیەكی « نەناسراو پیكاویێتیو لەبن گژوگیاكاندا كەوتووە بۆ ئەوەی سەربنێتەوە ، كەسێكیش نی‌یە ئاگاداری هەناسەی ساردیو لاوانەوەی بێت .

وەك راكردنێ لە ( فریشتەكانی دەریا ) و پێرۆزبایكردنو ئافەرینی ساختە ، ناچاربووم ، ئەو بانگكردنەی ، بەبۆنەی دەستپێكردنی شانۆگەری « یرما » وە بۆم نێرابوو پشتگوێ نەخەم .

بەڵام بەختیارترین ڕووداوێ لە ژیانی كورتما وەك دانەرێ هەستم پێكردبێ ئەو كاتەبوو كە زانیم ، كۆمەڵەی شانۆگەری لە مەدریدا ، داخوازی پیشاندانێكی تایبەتیی ئەو شانۆگەریەی كردبوو ، كە ژنە ئەكتەری مەزن « مارگریتا كیرگۆ »ی هونەرمەندی بە بەهرەی ئەستێرەی گەشی بزوتنەوەی شانۆگەری ئەسپانیا دەوری یەكەمی تیایا دەگێرێ ! بە ڕاستی رۆڵی خۆی بە ئەو پەری داهێنانەوە گێڕا بە هاوبەشی ئەو تیپەی بە تواناوە بەشداریكرد لەتەكیا لەمكارەدا . ئەم رووداوە ئەوەندەی بەلگەی بایەخ پێدانێكی ڕاستە بەو هەولانەی بەری ئەركێكی راستەقینەی شانۆگەرین كە پاڵم پێوە دەنێ سوپاسێكی گەرمی دلسۆزانە پێشكەشی هەمووتان بكەم . ئەوەش بزانن كە من ئەمشەو وەك نووسەرێ یان بوێژی لێرەدا قسە ناكەم . هەروەها خۆشم بە قوتابیەكی تازە كوورەی دەوڵەمەندی ژیان ناژمێرم ، بەڵكو وەكو حەز لێكەرێكی گەرمی ئەو شانۆگەریانەی بایەخ دەدەن بەكێشە كۆمەڵایەتیەكان دێمە ناوەوەو ئەم قسانە دەكەم .

راستی : شانۆ بەلای منەوە یەكێكە لە بەهێز ترین ئامرازەكانی دەربڕین . لە هەمووشیان بەكارترە بۆ رۆشنبیریكردنی میللەت . بگرە ئەو بارۆمەترەیە كە مەزنی یان كزیو لەناوچوونی نەتەوەیە نیشان دەدات .

شانۆی بە سۆزو ئاراستەكراو بە شێوەیەكی كارامە ، لە هەموو لقە جیاوازەكانی دا هەر لە تراژیدیاوە تا فود ڤیل دەتوانێ لە ماوەی چەند ساڵێكدا ڕادەی هەستكردنی نەتەوە بگۆڕێ . بەلام ئەم شانۆوە داروخاوانەی باڵێ بڵندی ئاسمان دەگۆرنەوە بە سمیو ولاخ ، ئەوە گومان لەوەدا نی‌یە نەتەوەیەك هەموو بەرەو نشێو دەبەنو بەجارێ هەستی شەلو ئیفلج دەكەن .

شانۆ : قوتابخانەیەكی فرمێسكو زەردەخەنەیە مینبەرێكی ئازادە كە خەڵكی دەتوانێ تیا یا پەردە لە رووی رەوشتی كۆنو بە پێچو پەنا هەڵماڵێ . وە لە روخسارێكی زیندوو درەوشەداردا چەند نموونەیەكی نەمری دڵی ئادەمیزادو هەستی پێشكەشبكەن . جەماوەرێ كە یارمەتی شانۆ نادات و هانی نادات جەماوەرێكی مردووە یان بەرەو مردن مل دەنێ ، هەروەها : ئەو شانۆیەی لە دوو توێدا بزوتنەوەی كۆمەل نیشان نەدات ، لێدانی دڵێ مێژوو كارەساتی نەتەوەكەیو بەراستی نیگاركێشی خاكو خۆڵو گیانی نەدات بە دەستەوە لە پێكەنینو گریانداو لە زەردەخەنەو فرمێسكیدا هەرگیز ئەوە ناهێنی ناوی لێبنرێ شانۆ . بەڵكو دەبێتە شوێن بۆ زابواردنو گاڵتەبازی یان بۆ ئەو جمو جۆڵە ترسناكەی كە پێی دەوترێ « وەخت كوشتن » .

لێرەشدا من مەبەستم كەسێكی تایبەتی نی‌یە ، ئامانجیشم خراپەكاری نی‌یە لەگەڵ یەكێكدا ، باسی باری ئێستاش ناكەم . بەڵكو باسی كێشەیە دەكەم كە چارەسەری نی‌یە . هەموو رۆژێ برادەران گوێم لەو دەمە قاڵیانەیە دەربارەی شانۆ دەكرێت ، واش دێت بەبیرما كە

ئەم کێشەیە لەبەر چاوی « ئێستاماندا » نی‌یە ، بگرە رەگو ریشەیەکی قووڵی داکوتاوە بە ناخە تاریکەکانی بنیادی شانۆدا ، کەواتە ئەم بارەی ئێستا پیادا دەروین دروست بووی دۆخێکی نوێ یان هەڵچوونێکی راستەوخۆنی‌یە بگرە کێشەیەکە کە رەگ‌و ریشەیەکی گەڵێ قووڵی هەیە .

بەکورتی کەم‌و کوڕیەکی بنەرەتی‌یە لە بنیادی رێکخراوی شانۆدا . چونکە تا ئەکتەرو دانەرەکان ژێر دەستەی ئەو دەزگا بازرگانی‌یانە بن کە هیچ شتێ جلەویان ناگرێ . نە چاودیری‌یەکی ئەدەبی یا سەرپەرشتی‌یەکی میری لێیان دەپرسێتەوە ، بگرە هەموویان بەردەستەی دەزگای وان کەفریان بەسەر هونەری بەرزەوە نی‌یە . جا بۆیە وەك سەر ئەنجامێ هونەرمەندو خاوەن بەرهەمەکان‌و شانۆ خۆی لە نزم بوونەوەیەکی پەی دەر پەیدان ، رۆژ لەپاش رۆژو بێ ئەوەی هیچ هیوایەکی رزگار بونیان هەبێ .

شانۆگەری سووکەڵەی پێشانگایی . شانۆگەری « فۆدفێل » شانۆگەری گاڵتەوگەپی هەرزان بەها .. کە هەموو یان لەو رەگەزانەن من یەکێکم لە سەیرکەرە هەمیشەیی‌یەکانیان دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکە . بەڵکو دەتوانن بوونی خۆیشیان رزگار بکەن . لە کاتێکدا شانۆگەری هۆنراوەیی ، درامای مێژوین‌و کۆمیدیای بە ئاوازی پەیرەوکاری ئەسپانی ، هەمیشە روو بە رووی گیروگرفت دەبێتەوە . چونکە لەو جۆرە ژانرانەن کە پێداویستی گەڵێ گەورەیان هەیە ، بێ‌گومان دەشتوانرێ گەڵێ نوی خوازی‌ی بنەرەتی تیادا بکرێ . جگەلەمەیش نە دەسەلات‌و نە ئارەزووی خۆبەخت‌کردنی هەیە بۆ ئەوەی ئەم جۆرە ژانرانە بە سەپاندن بسەپێنرێ بەسەر جەماوەری سەیرکەراندا . ئەو جەماوەرەی کە زۆر جار پێویستە چاوی لێ دابگیری‌و بەرهەڵستی بکرێ‌و هیرش ببرێتە سەری ( بۆ ئەوەی رادەی تێگەیشتنی بەرزبکرێتەوە ) .

چونکە شانۆ پێوستە خۆی بسەپێنی بەسەر جەماوەردا نەك بەپێچەوانەوە . بۆ بەدی هێنانی ئەم مەبەستەش پێوستە دانەرو ( نووسەر )و ئەکتەرەکان خاوەنی دەسەلاتێکی گەورەبن ، تەنانەت ئەگەر ناچاربن خوێنی خۆیان ببەخشن لە پێناوی‌دا ، چونکە جەماوەری شانۆ وەکو قوتابیانی قوتابخانەکانن، بەرهەڵستی مامۆستایەکی راست‌و کەللە رەق دەکەن کە دادپەروەری‌و بەهای زانستی لەلایە . بەلام بۆ ئەو مامۆستا دوو دڵە کزۆلانە هیچیان لەبەردانی‌یە ( رستی ) بزماری ئاسنین بەبێ بەزەیی‌یانە بەسەر کورسی دانیشتنیان دا دەکوتن ، ئەو جۆرە مامۆستایانەی خۆیان هیچیان لە دەست نایەت بۆ فیرکردنی جەماوەر ناشیەلن خەڵکی کە ئەرکی فیرکردنیان بگرێتە ئەستۆوە .

ئەبێ بزانین کە روشن بیرکردنی جەماوەر ــ سەرنجیان رادەکێشم کە دەڵێم جەماوەر نەك میللەت ــ شتێکەکە لە توانادا هەیە بکری ، خەڵکی وام بینیوە کە گوێیان لە هونەرمەندی وەك ( دیبوسی )و ( راڤیل ) بووە پێشی چەند سالێك کردۆیانەتە هەراو فێکە کیشان ، کەچی پاشی چەند سالێك هەر ئەم بەرهەمە هونەری‌یانە گەرمترین پێشوازی‌یان لێ‌کراوە کە ووترا لەمەو بەر بەرپەرچ کرابوونەوە بۆچی ؟ چونکە ئەم دوو هونەرمەندی ئاوازە بە زۆر سەپێنران بە سەر کۆمەڵی سەیرکەراندا .

هەر بەم جۆرەش لەگەڵ « ودکند » لە ئەڵەمانیاو « بیراندللو » لە ئیتالیا ئەم کارە مەیسەر کرا .

بەڵێ دەبێ بەم جۆرە بۆ چاکەی شانۆو بەرژەوەندی شانۆکان بەرێوە بچێت لە پێناوی چەسپاندی پایەی ئەکتەرەکان‌و ریز لێنان لی‌یان ، چونکە پێویستە ئەم هونەرمەندانە بە هەموو جۆری سەربەرزی خۆیان بپارێزن‌و دڵنیابن لەوەی کە پاداشتی هەوڵ‌و کوششیان یەك بەسەد دەبن . هەر هەلویستێکی کەش دەبێتە مایەی ئەوەی کە کۆمەڵی هونەرمەندان بنە تیپێ لە پشت پەردەکانەوە بترسن‌و بلەرزن . هەموو ئەو ئەندێشەو شۆخ‌و شەنگی‌و جوانی‌یەی کە لە شانۆدا هەیە بیکوژن !

شانۆ هەموو وەختێ هەر هونەر بووە . وە هەمیشە وەك هونەرێکی بالآ دەمێنێتەوە . سەرەرای گیانی ئەم سەردەمە کە گەڵێ ناوی خراپی بەسەر هونەردا بریوە ، هەولێ ئەوەی داوە

ناوو هەوای پیس بکاتو هۆنراو لە ناو بەرێتو شانۆ بکات بە لانکەی دلڕەقیو زەبرو زۆر .

بەلێ شانۆ بەر لە هەموو شتێ هونەرەو بەرزترین جۆری هونەریشە ! ئێوەش ئەی ئەندامانی ئەم تیپە خۆشەویستە ! بەر لە هەموو شتێ هونەرمەندن ، هونەرمەندن لە تەوقی سەرتان تا کولەمستی پێتان . چونکە لەرێی ئەڤینو لە رێی پیشەکاری هاتوونەتە جیهانی شانۆگەریەوە ئەو جیهانەی پڕە لە خەیاڵپلاو پریشە لە هیواو ئاوات . ئێوە هونەرمەندن بە پیشەو بە حەز لێکردنی خۆتان .

پێوستە لەسەر هەموو شانۆکان لە بچووکترینیانەوە تا گەورەترینیان ووشەی ( هونەری ) بنەخشێنرێ ، لە هۆلە گەورەکانداو لە ژووری ئارایشتکردندا . لە ژووری جل گۆڕیندا ئەگینا ناچار دەبین لە بریتی ووشەی پیرۆزی هونەر : ووشەی « بازرگانی » بنووسین . یا ووشەیەکی کە ناوێرم ناوی بهێنم . جگە لەمەیش پێوستە پەیرەوی لە قسە دەرنەچوونو ئامادە بوون بۆ خۆبەخت کردنو ئەڤین لەنێوماندا هەبێ .

ئەوەش بزانین کە من نامەوێ لەم شوێنەدا وانەیەکتان بۆ بخوێنمەوە ، چونکە من خۆم لە هەموو کەسێ زیاتر پێوستم بە وانەی ( فیرکردنە ) بەلکو خوێن گەرمیو بڕوا بە ئێوە زۆری بۆ هێناوم ئەم ووشانەم لە زار بێتەدەرێ . لەوێشدا ژێر دەستەی کارکردنی هیچ جۆرە خەیالێکی پووچ نیم . چونکە ئەم بیروڕایانەم چەندان جارو وەختێکی درێژ شەنو کەو کردۆتەوە ، بەبێ هەلچوون ، منێ کە خوێنی ئەندەلوسی بە دەمارەکانما دەگەرێ ، دەشتوانم خۆم بگرمو هەستم راگرم چونکە خوێنی من خوێنێکی رەسەنە . من دەزانم ئەو کەسەی هاوار دەکات . ئەمڕۆ ! ئەمڕۆ .. نانیش لە تەنیشت ئاگردانەیەوە ( بەهێمنی دەخوات ) لەسەر هەق نیە . بەلکو ئەو کەسە راست دەکات کە بەهێمنییەوە سەیری ئاسۆی دوور دەکات . بە دلنیایەکی تەواوەوە دەڕوانێتە یەکەم گزنگی بەیان کە پەخش دەبێتەوە بەسەر دێهاتو مێرگەکاندا .

من دەزانم ئەو کەسە هەلەیە ، کە بەدەم هاوارەوە دەلێ : هەر ئێستاو بە خێرایی ! سەیری پەنجەرە تەنگە بەرەکەی پلیت فروشتن دەکات . بەلام ئەو کەسە لەسەر هەقەو هەلە ناکات ، کە دەلێ « سبەینێ ! سبەینێ ! » وە لە تەکیشیا هەست بە هاتنی ئەو ژیانە نوێیە دەکات کە بەسەر جیهاندا کەوتووتە بالە فڕکێ !؟

**پەراوێزەکان :**

**١ – فیدریکو گارثیا لۆرکا ( ١٨٩٩ – ١٩٣٦ ) بوێژو نووسەرێکی شانۆیی ئەسپانی‌یە ، یاسای خوێندووەو بایەخی داوە بە هونەری میللیو ئاوازو وێنەگرتن . ماوەیەك بەڕێوەبەری شانۆی زانستگا بووە . لایەنگیرەکانی (( فرانکو )) لەسەرەتای جەنگی میللی ئەسپانی ١٩٣٦ کوشتیان . بەناوبانگترین بوێژەکانی جیهانە ، کە بە ئەسپانی قسە دەکەن لە هۆنراوەکانی‌دا دەربڕینی میللی بەکار دەهێنێت .**

**لە ناوەڕۆکی هۆنراوەکانی‌دا ئەو شلەژانو راچەنینە دەردەکەوێ کە لە تەك شارستانێتی نوێدا هاوجووتە ! هۆنراوەکانی تێکەلاوی‌یەکە لە هەموو ئەو شەپۆلە بنەرەتی‌یانەی رۆشنبیریی ئەسپانیی هاوچەرخ پێك دێنیت .**

**٢ – کلود ئەشیل دیبۆسی ( ١٨٦٢ – ١٩١٨ ) دانەرێکی ئاوازی فەرەنسی‌یە .**

**٣ – مۆریس راڤێل دانەرێکی ئاوازە لە فەرەنسا لە قوتابخانەی ئینطباعی ، دیبۆسی کاری کردوتە سەر هونەرەکەی لەگەل موسیقاری رووسی دیکس کورساکۆف . سالی ١٨٧٥ لە دایك بووە . دانەری ئاوازی ( بۆلیرو )ی بەناوبانگە .**

**٤ – فرانك ودکند ( ١٨٦٤ – ١٩١٨ ) نووسەرو دانەرێکی شانۆکەری ئەلەمانی‌یە . مامۆستای ( بارتولد بریختە ) بەناوبانگترین شانۆنەری‌یە نووسیبێتی (( لە خەو هەلسانی بەهارە )) .**

**٥ – ئەم لێدوانەی ( لۆرکا ) لە پاش پیشاندانێکی تایبەتی شانۆکەری ( یرما ) لە مەدرید سالی ( ١٩٢٥ ) خوێندراوەتەوە ، لە سەرجەمی بەرهەمەکانی لۆرکادا . بەشی هەشتەم لاپەڕە ( ١٥٣ – ١٥٨ ) چاپی لووسادا ، بۆینس ئایرس سالی ١٩٤٩ بلاوکراوەتەوە .**

# دەنگی ئافرەتی کورد له

نووسینی
غفور صالح عبدالله

## پێشباسی .. (( ١ ))

**ئەوەی شایانی باسە کە ئەدەب بەگشت لنەکانیەوە ، دەبێ بۆ خزمەتی پاککردنەوەی دڵو دەروونو مێشکو زانی مرۆڤ بێت ، لە هەموو خڵتو خەوشو چڵکو تێمو ئاوماڵکو سەرکۆزەرو مرۆری دووفاقییو ناهەمواری ، و رەوشتی هەرزانو چەوتو نابەجێو عادەتی نەشیاوو نەگونجاوی مرۆڤانەو کینەو رقە بەرایەتییو دژایەتیو دوژمنکارییو تەقەکردن رووەوتاریکیی دووربێ دەبێ کونجو کە لەبەرز فوژبنە تاریکو نتکو ئەنگوستە چاوەکانی ناخی ولاّیی دەروون روونائ کاتەوەو تارماییو خێوو خاڵە رەشو بۆزغونەکانی بۆ هەتا هەتایە بنبرکاتو کوێریان کاتەوە ، .. جا ئەمە ئەرکی ئەدەب بێ دەبێ ئەدیب چۆن بێو چ کەس بێ و کوێنەری بێت ؟ ...**

ئایا خانەدانو خواپێداو و لەبەرسێبەر نووستوو دەبێ ئەو ئەرکە پیرۆزە راپەڕێنێ ؟ یاخود ئەو کەسانەی لە لیتاوو زلکاوی ژیانی کەسایەتی تایبەتی خۆیاندا دەگەوزێنو تلاوتل دەکەن ، و هەمیشە برسیو رووتو قووتو دەربەدەرو نەفرەتلێکراو و بێ نەواو بێئامێز بوون ... ئەی ئەگەر لەم جۆرە کەسانە نەبن چۆن دەردەسەرییو ژانو لێقەوماوییو رەنجبێوەری زگماکی مرۆڤایەتی دەدۆزنەوەو دەیکەنە هەوێنی بەرهەمی پوختەو ڕەسەن .. ؟ . هەروەکو « دۆستۆیفسکی » دەڵێ :

**« زۆربەی بەرهەمەکانم خودی خۆم تێدا تواندونەتەوە » .**

بەتایبەتی بەرهەمەکانی ئەم زاتە ، لەم سالاّنەی دواییەدا بوونەتە باوو ناوی دۆستۆیفسکیش بەسەرزارەوەیە ، گەرچی تا ماوەیێکی زۆریش لە ولاّتی سۆڤیەتدا بەرهەمەکانی قەدەغە کرابوون ، .. یاخود « فرانز کافکا » بەهەمان رەواڵەتو بەترسەوە پەنجە درێژ دەکرا بۆ بەرهەمەکانی ...

ئەنجا مەبەستم لەم وتەیە ، بەرگریکردنو پاکانەکردن نییە بۆ هیچ کەسێك ، یاخود زلکردنەوەو پیاهەڵدانی چ نووسەرێك .. تەنیا مەبەست ئەوەیە کە لەمەڕ ئێمەدا ، وا قاوو باوە ، بگرە لە زۆربەی شوێنو جێگای ئەمگێتییەدا ، هەرکە بەرهەمێکی هونەریی یا ئەدەبی لە دایك دەبێ ، ئەگەرچیش هەرچەنێ سەرکەوتوو و لەبار بێت ، ئەوا بەپێی زەین تەسکییو بێ هیچ مشوورخواردنێك ناوی خاوەنەکەی دەخوێنینەوەو حوکمێکی سەختی نابەجێو پووچەڵ بەسەر بەرهەمەکەدا دەدەینو بێ ئەوەی رستەیێکی لێ بخوێنینەوە ، ئیتر مەکە مەکەیە و ئەمە هی فلانەکەسو فیسارە کەسە ...

منیش « لە پاداشتی قسەی سەردا ، هەمە ئاهو هەناسەی گەرم ، کەسێك شێتانە بەردم تێئەگرێ من بەرقی تێئەگرم ... » ، منیش دەڵێم ئەی خۆشبەحاڵی ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ئەدەبی جیهانی نینو نازانن زۆربەی داهێنەرانی دونیا چۆن گوزەراونو شاکارەکانیان

# کۆمەڵە چیرۆکی کوردا

بەچی پەتپەتیەك بەناکام گەیاندوە .. ئەی خۆشبەحاڵی ئەو کەسانەی ئاگاداری دڵو دەروون جەنجاڵو مێشکی خوراوەی ئەدیبی رەسەنو کامڵ نینو هەمیشە بۆ سنگ دەرپەڕینەکان دەستەووەنەوز دەوەستن ، و خنەخنیان بۆ دەکەنو شاباشیان بۆ هەڵدەدەن .. ئەی خۆشبەحاڵی ئەو خوێنەرەی کە نازانێ رامبۆ ، بۆدلێر ، ئەدگار ئالان پو ، هەمنگوای ، مەکسیم گۆرکی ، ئەلبێر کامۆ ، جێمس جوێس ،

سارتەر ، جاك لندن ، بێکەس ، گۆران ، چۆن لە لیتاو و زلکاوی ژیانی کەسایەتی خۆیاندا وەنەوزیان کردوەو گینگڵیانداوە ، و هەریەکەو جۆرە نەخۆشییەکی کوشندەی لە یەکەم رۆژی ژیانیەوە خەڵاتکراوە .. و هەر بە گوێرەی کێوو تەلانی چەرمەسەریەکانیان ، بەرهەمی لەبارو سەرکەوتوو نەمریان بۆ مرۆڤایەتی بەجێهێشتووە، تاوەکو ئەمێستاش مشتومڕ و بگرەو بەردەیان لە سەردەکرێ ، هەزارەها کۆڕی ئەدەبیان جۆشداوەو بونەتە هۆشیارکەرەوەی سەدان ملیۆن مرۆی سەرزەوی ، هەروەها هەریەکەو بۆتە رێبازو قوتابخانەیێکی تایبەتی لە ئەدەبدا ...

## پێشباسی .. (( ٢ ))

بەرای من تاوەکو ئێستاکە ئێمەی کورد ، کۆمەڵێك چیرۆکنووسی پیاومان هەیە ، هەریەکەو رۆڵێکی تایبەتی گێڕاوەو بۆی کراوە کەلەبەرێك لە جۆگای ئەدەبی چیرۆکنووسیی کوردیدا .. هەڵبەستێ کەم تا زۆر هەرکەسەو بە پێی سەردەمەکەی خۆی شتی وتووەو نەوتووە ، زۆربەی نووسینەکانیانیش سەبارەت بە کۆمەڵی پیاوی کورد بووە ، ئافرەتیش وەکو پەراوێزو هەوێنو ترشوخێ لەبەرهەمەکانیاندا بەکارهاتووە تەنیا بەرەوالەتی دەرەوەی نەك ناوەوە ، هەروەکو نیگارکێش وێنەی ئافرەتێکی جوانکیلە بەرەنگو بۆیە بکێشێ وەکو ئادەمیزادێك هەستو ئارەزووەکانی پشتگوێ دەخات .. ئەنجا ئافرەتیش وەکو خۆشكو دڵدارو ژنو هاورێیو دایكو ئەو ئادەمیزادەی کە هەزاران بڕەو بەچکە شێرو بڵنگی کێوانو دەریاو بیابانەکانو زاناو بلیمەت دەخاتەوەو پەروەردە دەکات ، بۆ دەبێ لە مافی رەوای مرۆڤانەی خۆی بێبەش کرابێو هەردەم بە چاوێکی سووكو نزمەوە سەیریکراوەو هەستو نەستو خولیاو ئارەزووەکانی پێشێل بکرێ ... هەروەکو بێکەس دەڵێ :

**نەسرین دەمێکە داخت لەدڵمە**
**گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە**
**وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە**
**هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە**
**سەرپۆش فڕێدە چی وادەی شەرمە**

جا ئەو چیرۆکنووسانەی کە تا ئێستا چیرۆکی ئافرەتی چەوساوەی کوردیان گێڕاوەتەوە، هەروەکو ووتمان لەبەرەی پیاوان بوونو هەمووش چەشنی کەسێکی نێرینە بیریان کردۆتەوە لەئێشو ئازارو باری دەروونی ئافرەتێك .. ئەمەش زۆر جیاوازترە لەوەی کە ئافرەتێکی چیرۆکنووس ◁

بەســـــــەرهاتو گیروگرفتو ململانێی ڕۆژانەو هەڵچوونو خولیای دەروونی ئافرەتێك دەبڕێ ، ئەم کارەش گەلێك سەرکەوتوو و شیاوتر دەبێ لە هی پیاوێك .. بگرە تاوەکو ئێستا ئــەو ئافرەتــە چیرۆکنووسانەش هەمانە ، ئەوانیش کەم تا زۆر سەبارەت بــە ململانێو زۆرانبـــازیو گوزەرانی پیاو ، چیرۆکیان نووســـــیوەو هەمان ڕچەیــان گرتووە ، بگرە ئەقڵیان بەسەر ســۆزو دەروونیو پێداویستیەکانی ژیانی تایبەتی خۆیاندا نەشکاوە ، کەچی ئەمانەش ناگەنە ژمارەی پەنجەی دەستێك .. ئەوەی چیرۆکنووسە پیاوەکانیشـــن ئافرەتیــان وەکـو عونسرێکی تەشـــویق بۆ ڕوونکردنەوەی ڕوانگەیێکی تایبەتی بەکارهێناوە .. یاخود وەکـو هاندەرێك بۆ خەباتکردنو ناڕەزاییو بەرگریکردن، و هەمیشـەش چمكو دامێنی کرۆکی چیرۆکـەکـە بووە ، زۆرجـاریش پـەراوێزو بۆ گـونجـاندنی مەبەست لە بارتەقەی چیرۆکەکەدا وەکو ئامێرێکی جۆشـــێنەر بکار هێنراوە .. یان ئەگــەر بــە دەگمەنیش پاڵەوانی سەرەکیی چیرۆکێك بووبێت، ئەوا تەنیا بۆ مەبەستێکی دڵداریەکی ڕۆمانســـیانە بووەو هیچیدی ، ئەوەیشی لەبیر چۆتەوە ، کــە ئافرەتی کورد دیلی پیاوە لە کۆمەڵێکی کلۆڵو دیلو دەستەو ئەژنۆو دەسەپاچەدا ...

**« ئەم ئێوارەیە کە بە شەقامەکەدا دەهاتمەوە بۆ ماڵێ هەتاو بەقەد ژمارەی تیشکەکانی سێبەری بۆم دروست کرد ، نەمدەزانی کامیان ســـێبەری ڕاستەقینەی خۆمن .. ؟ ڕەنگە هـــەموویـــان .. نەخێر هیچیان سێبەری من نەبوون ... نەمزانی چیبوو هانی دامو لەخۆمم پرسی ، ئەرێ ســێبەر لەچییەوە دروستدەبێ یانی مادەیسێبەر چییە.. بۆچی تـــەنهـــا دوو ( بوعدی ) هـــەیـــە .. دیـــارە دەبینرێ ، کـەچی هیچ کـەڵکێکی نیـــە .. ڕەنگە ئافرەتی کوردیش سێبەر بێ .. پیاوان تەنها بـۆ حەسانەوە پەنای بۆ بەرن !! »(١)** .

**پێشباسی .. (( ٣ ))**

لە شارێکی کوردنشینی وەکو ــ خانەقین ــ شارێکی زمان کوردی شێواوو کەمبڕشـــــــــت « مەبەستم لە زمان کوردی شێواوو کەمبڕشت ، ئەوەیە چونکە کوردەکانی ئەو دەورو بەرە بەشێوەی لوڕی نیمچە ئارەوی قســـەدەکەن ، زۆر جیاوازە




لەگەڵ شـێوەی سلێمانیو شارەکانی تردا » کچە کوردێکی چاوقایمو جەربەزەو ســـەربەســـتو نەترسو کوردیزانو زمـان پاراو و خزمەتگوزاری وشـەی کوردیو هونەرزانو شۆخو شـــــەنگو ڕۆژنامــە نووسی « ئەحـلام مەنـــــوور »ی پەروەردەکردوە ، وە هەروەهاش مامۆســـــتا عبدالمجید لطفی ــ ی ئەدیبی گەورەی عیـــراق ، گەرچیش مامۆستا لطفی نووسینەکانی بە زمـانی عارەبین ، بەڵام بەلای منەوە بە ئەدیبێکی کورد لە قەڵەم دەدرێ ، چونکە لە زۆر بوارو هەڵوێـستیدا کوردانە خۆی دەرخستووە و لەم ســــــاڵانەی دوایەشدا خەریکی نووسینە بە زمانە زگماکەکەی، هەروەکو لە دانیشتنێکدا ئەمەی دەرخست ...

هەروەکو ووتمان ئەم کیژە چیرۆکنووســـە لە شاری ــ خانەقین ــ لە دایك بووە ، خوێندنی زانکۆیی لە کولیجی ئەدەبیات بەشی کوردی تەواو کردوە . ســــــەردەمێکی زۆریش ڕۆژنامەنووس بووە ، ئێســــتاکەش فەرمـانبـــەرێکی وەزارەتی کشتوکاڵە لە شـاری بەغدا ...

**پێشباسی .. (( ٤ ))**

ئەم باســـە کورتەمان ســـەبارەت بەدەنگی

ئافرەتی چەوساوەی کوردە ، لە چیرۆکەکانی « ئەحلام مەنسوور »دا ، پتر ئەمجارەش لەو چیرۆکانە دەکۆڵمەوە کە بە کۆمەڵەیێکی خنجیلانەو قەشەنگ بڵاوکراونەتەوە بە ناونیشانی « پرد »وە ، کە دەزگای رۆشنبیریی‌و بڵاوکردنەوەی کوردی وەچاپی گەیاندوە ، ئیستاکە لە بازاڕدایە بۆ بەر دڵو دەروونی خوێنەری کورد ، « ١٨ » کورتە چیرۆکی بە خۆیەوە گرتووە ..

**١ – فەقێ عەباس‌و دیمەنێکی لەیاد نەچوو .**
**٢ – گوناهەکانم یەکتری دەسووتێنن .**
**٣ – پەیکەر .**
**٤ – شەو .**
**٥ – کەمان ؟**
**٦ – لە گۆڕستاندا .**
**٧ – سەرەتایێک بۆ نووسینێکی نوێ .**
**٨ – بە بێدەنگیی مرد .**
**٩ – مانەمان ناوێ .**
**١٠– چارەنووس .**
**١١– جارێکی‌تر بە پەڕۆ رەشەکە هەردوو چاومیان توند بەستەوە .**
**١٢– یاداشت .**
**١٣– پرد .**
**١٤– خەونێکی هێمن .**
**١٥– بێدەنگیەکی هەمیشەیی .**
**١٦– چاویلکە .**
**١٧– کورتە چیرۆکێکی ناتەواو .**
**١٨– تۆشەیێکی ژیانی رەعنا ...**

وە لەبەر کەمدەرفەتی نەمانتوانی ئەو چیرۆکانەی‌تری وەچنگ بهێنین کە چیرۆکنووس کاتی خۆی بڵاوی کردنەتەوە ، تا وەکو باسەکە پترو تەسەل کەین . و بتوانین مافێکی رەواو چەسپاویان پێبەخشین ، و شتێك بە شتێك بکەین ، ئەگەر ئەمجارەش نەمانتوانی ئەوا لە دەرفەتەکانی‌تردا ، ئەم ئەرکە قورسەی سەرشمانمان وەکو رۆشنبیرێکی کورد ئەنجام بدەین ، یان ئەوەتا نەسێکی‌دی وەکو رەخنەگرێکی لیهاتوو و بێلایەن ، شە‌ سیتەڵیان دەکاتەوەو

دەیانخاتە جیگای راستەقینەی خۆیان ، چونکە ئەمەی من تەنیا بۆچوونو روانگەی تایبەتی خۆمن‌و هیچی‌دی ...

مامۆستای ئەدیب « تەها بابان » لە موحازەرەیەکدا کە بۆ لێدوان لە سەر هونەری چیرۆك تەرخانی کردبوو دەڵێ : چیرۆکەکانی « ئەحلام مەنسوور » نموونەی چیرۆکی زاتین لە ئەدەبی کوردیدا ... هەرچەندێ بەش‌بەحالی خۆم ئەم موحازەرەیەم بەکاسێت گوێی لێبووە بەڵام بەتەواوەتی مێژووی رۆژی بەستنەکەی وەیادم نایەتەوە ، بۆ ئەوەی پتر قسەکەمان لە جێی خۆیدا بێت‌و دیزە بە دەرخۆنە نەبێت ، بەڵام هەر نە ئێستا ... منیش ئەوە نییە تەنیا بەدەمە پالی ئەم رایەی مامۆستا – تەها بابان – وە بەلکو دەڵێم ئەم جۆرە چیرۆکانەی کۆمەڵەی « پرد » بێوێنەن ، نەك لە ئەدەبی کوردیماندا بگرە لە ئەدەبی رۆژهەڵاتی ناوەراست‌و تا دەکاتە ئەدەبی جیهانیش ، تەنیا من بەش‌بەحالی خۆم دوو نموونەم وەبەرچاو کەوتووە ، ئەوەش لە دوو شاکاری جیهانی نەمردایە ، کە جووتە خۆشکی « برۆنتێ » « شارلۆت‌و ئەمیلی برۆنتی » نووسیوانە . رۆمانی « بەرزایەکانی ویزرنگ » و « جین ئەیر » ... دەشێ نموونەی‌تری هەبن وەبەرچاومان نەکەوتوون ، بەڵام لە ئەدەبی کوردیمان کەسێکی ئەو جورئەت‌و زاتەی نەکردوە بەراستی‌و رەوانی چیرۆك بەجۆرەو ئسلوبێکی داچۆڕراو بەسەلیقە دابڕێژێ ، ئەگەر بێتو ئەمەش لەلایەن ئافرەتێکی کۆمەڵێکی هەرە دواکەوتووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بێت ... ئەوەی شایانی باسە ئەو دوو رۆمانە ناودارە « بەرزایەکانی و بزرنگ » و « جین ئەیر » کاتێك کەوتنە بازاڕەوە دەیان رەخنەی توندوتیژیان لێگیراو بە دوو رۆمانی « نا ئەخلاقی » درانە قەڵەم وجووتە خۆشکی برۆنتێش سەدەها توانج‌و قسەی سووك‌و تەشەریان ئاراستە دەکرا ... پاڵەوانی ئەو جووتە رۆمانەش ئافرەتی چەوساوەی تووندکراوی نێوان چوار دیوارن ، کە نەریت‌و ئایین گشت رێگایێکی لێبەستوون ، هەست‌و ئارەزووی راستەقینەی خۆیان دەردەبڕن وەکو هەموو ئادمزادێکی دیکەی ئازادی کۆمەڵ ، دەچنە تژی هەموو نەریت‌و داب‌و دەستورێکی چەوت‌و

ناپەسەنی کۆمەڵایەتی دژ بە مافی رەوای ئافرەت ، پەردە لەرووی عەیبو شوورەیی‌و ناکەسبەچەیەك هەڵدەماڵن ...... ئەمە ئەوە بووە کە ئەخلاقیەتی کۆمەڵگای ئەوسای ئەوروپا بۆی هەزم نەدەکراو یاسای کڵێسەش ببووە قەمتەر و گشت رەفتارێکی دوورو نەگونجاوی ئەوساکەدا زیندە بەچاڵ و لغاو دەکرد ، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەم دوو شاکارە ئەدەبیە ، تاماوەیێکی درێژخایەن بەدناوبکرێن .. بەڵام پاش ئەوەی هەندێ لە رەخنەگرەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی ، کە دوو بەرهەمی تازە بابەتن‌و دەبێ رێزیان لێبگیرێ .. ئەوە بوو جووتە خۆشکی « برۆنتێ » پیان ووترا « خۆشکە ئازیزەکان » و بگرە بووە نازناوێك بۆ ئەم جووتە خۆشکە ئەدیبەو جووتە بەرهەمە نایابەکەیانیش ، کەوتنە بازارەوە و باوشیان بۆ کرایەوە ، هەروەها وەرگێردرانە سەر زۆربەی زمانەکانی دونیا ... مەبەستیش لە هێنانەوەی ئەم نموونە ئەوەیە چونکە « ئەحلام »ی چیرۆکنووس هەندێ شتی تازەی لە چیرۆکەکانیدا ووتووەو بە بێ‌هیچ ترس‌و لەرزو خۆکوشینێك ، بگرە خۆی وەکو قارەمانێکی هەموو چیرۆکەکانی خۆی دەخاتە روو ، دەشێ زۆرکەسی بیرتەسك‌و کەم‌بینا بۆی هەزم نەکرێ ...

* * *

**« ئەو دەمەی بیردەکەمەوە لەو ئەرکەی کە هونەرمەند خۆی بۆ تەرخان کردوە ، ئەویش رووت‌کردنەوەی ئەو قیەمانەیە کە لە ئاراداهەن ، دەبێ لە ئاژاوەی دەورو بەرکەیەوە لە خۆیەوە رژێمك دروست بکات ، تۆوی تێکۆشان‌و نارەزایی بچێنێ ، تاوەکو بەهۆی بەرەڵلاکردنی عاتیفەوە مردووان بۆ ژیان دەگەرێنێتەوە ، ئەوسا ئە بەپیریی ئەو کەسە مەزن‌و کەم نموودانەوە دەچم ، شڵەژاوییان عەزیمەتم زیندوو دەکاتەوە ، وورتە وورتەکەیان وەکو مۆسیقایێکی خواهانە لە گوێمدا دەنگدەداتەوە »(۲) .**

**— هنری میللەر —**

* * *

کۆمەڵە چیرۆکی « پرد » دەنگی هەناسە ساردیی‌و ناڵەو نزاو خۆشەویستی‌و بێدەنگیی‌و خەون‌و بێدەسەڵاتیی‌و دڵەگوتێ‌و ترس‌و سەرکوێرکردن‌و رژانەوەو خەمخواری و ووروژاندن‌و سەرکوتکردنی هەست‌و ئارەزووەکانی ئافرەتی چەوساوەیە ، کە لە ژێر رکێف‌و دەسەڵاتی کۆمەڵدا دەناڵێنێ‌و لە بچووکترین مافی رەوای خۆی بێبەش کراوە ، ئەویش مافی هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی‌و وەکو مرۆڤێك بیر بکاتەوە لە دوا رۆژی خۆی ئەوەك چەشنی تابیع‌و یەدەگ .. ئەمەش چیرۆکنووس بەشێوەو ئسلوبێکی تازە داپرشتووەو مۆرکێکی هونەریی تازەی لە چیرۆکەکاندا بەکارهێناوە ، .. زۆرجاریش چیرۆکنووس « ئەحلام » خۆی وەکو ئافرەتی کۆمەڵێکی جەنجاڵ‌و پرزەبراو ، بۆتە قارەمانی چیرۆکەکانی ، ئەمەش کارێکی جەربەزەو لەبارە ، یاخود وەکو کامێرایێك رووداوەکانی بە ئەمانەتەوە نیشان دەدات .. پتر توانیویتی لە مێشك‌و دڵو دەروون‌و ناسۆری ئافرەتی کورد بکات‌و دڵشکاویەکانی بخاتە روو ..

زۆرجار قارەمانی چیرۆکەکان ئافرەتی هۆشمەندو رۆشنبیر یاخود نیمچە رۆشنبیرو مرۆڤانە بیردەکەنەوە ، هەمیشە خۆیان رادەپسکێنن بۆ ئەوەی لە بیرتەسکیی‌و کوت‌و پێوەندەکانی کۆمەڵ خۆیان رزگار بکەن‌و ببنە خاوەنی قەوارەی مرۆڤایەتی خۆیان .. ئەنجامی ئەم خۆ راپسکاندنەش تووشی سۆفیەتی‌و وجودیەت دەبن‌و بێدەنگ‌و دەروون خەنجالیان دەکات ، دووچاری خۆکوشتن دەبن ، یاخود بەشێوەیێکی تراژیدیانە کۆتایی بە ژیانیان دێت ،.. ئەم ئەنجامەنەش پتر شانۆگەریەکانی — گارسیا لورکا — مان وەیاد خاتەوە کە دەنگی خوێن دەبێتە تاکە دەنگ‌و هەموو دەنگەکانی‌تر دەپۆشێ .. ئەوەتا چیرۆکی « نەفێ عەباس و دیمەنێکی لەیاد نەچوو » لە شێوەی دراماییکی شەکسپیرانە کۆتایی پێدێت ، پتر قالبێکی تراژیدیانەی هەیە ، گەرچی چیرۆکنووس بەرامبەر رووداوەکان هەندێك دەستەوسان وەستاوەو بە جۆرێکی واقیعانەتر ، بۆ پاڵەوانەکان رێگای نەکردۆتەوە ، هەروەکو بڵێی رووداوەکە دەقاودەقی نووسراوەتەوە ، بێ ئەوەی شوێن پەنجەی چیرۆکنووسی پێوە دیار بێت ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نەیویستوە کەسانی چیرۆکەکە ببنە

داشی دامەو بە ئارەزووی خۆی جێ گۆڕکییان پێ بکات ، بگرە جڵەوی بۆ ڕووداوەکان شل کردوە تاوەکو خۆیان شوێن ئاوەڕوی خۆیان بکەون ...

« عەباس » بۆ کاری نان پەیاکردن‌و گوزەران بەرەو خانقین دەڕواو دەبێتە فەقێی مزگەوتەکەی گەرەکی ـ مەلیحە ـ ، ئەویش کچی بێوە ژنێکی پاقلە فرۆشن ، گیرۆدەی خۆشەویستە بەکتر دەبن ، و تا دێت جۆش دەسەنێ ، پاش دوو ساڵ ئەم داوە دلداریە پڕ جۆش‌و خرۆشی‌و پیرۆزە بە چەقۆکەی ـ مچە قەساب ـ دەپسێنرێ‌و مەلیحە بە پارچە زێڕێک‌و ۲۰۰ دینار بە ـ مچە ـ دەیدەن بە مێرد و ـ عەباسیش ڕەنجبێوەر دەمێنێتەوە ... پاش ئەوەی ـ مەلیحە ـ بە بێ دڵیی‌و ڕەزامەندیی خۆی بەمێردی دەدەن ، عەباسیش وەکو شۆڕشگێڕێکی بیرتەسک‌و بێ بنەما دەکەوێتە گێژاوەی عاتیفەو هەڵەشەیی خۆیەوە ، بڕیار دەدا ـ مچە ـی هاوڕێی بکوژێ تاوەکو کاری بە مێردانەکەی ـ مەلیحە ـ هەڵوەشێنتەوە دەنا چ چارەسەرێکی تری لەبەردەمدا نەماوە ، چونکە بارو دۆخی کۆمەڵەکەی دواکەوتوو سەرپلە ، و ئەندامەکانی لە جوغزێکی تەسکدا دەسووڕێنەوەو ژیانی مادی بەلایانەوە گشت ئەخلاقیەتێکیان، لەبیر دەباتەوە .. وە هەروەها چ دەرفەتێکی لەپێشدا نییە ، جگە پەنا بردنە بەر کردەوەیێکی ئینتیحاری نەبێت .. « تەقەی دەمانچەیێك هەموو دەنگەکانی قووتدا ، بووکەکەش پەلەخوود بوو »(۳) ... بەڵام ئەو گوللەیی ئاراستەی ـ مچەی دەکات بەر ـ مەلیحە ـ دەکەوێت ..

**« عەباس بە دەمانچەکەیەوە لەسەربانی مزگەوتەکەوە هاتە خوارەوە هەموو خەڵکەکە ڕایان دەکردو لە دەمانچەکەی دەستی دەترسن ، گەیشتن ئەو شوێنەی خوێنەکەی مەلیحەی لەسەربوو ، ڕاوەستا ڕووی لە ئاسمان کردو دەمانچەکەی نایە کەللەی خۆیەوە .. تەوت »(٤) . ل۲۲**

تەکنیکی چیرۆکەکەش لە شێوەی مونتاژ زیرەکانە بەکارهێنراوە ، چیرۆکنووس چەشنی وێنەگرێکی سینەمایی لێهاتوو ، دیمەن‌و شوێنکانی ڕووداوە دەوروبەرەکەی وێنەکێشاوە ، لە زۆر شوێندا بەشێوەیێکی درامی سفت‌و خەست دارێژراوە پتر شاعیرانەو دەست ڕەنگینی پێوە دیارە ..

**« جیکەجیکی چۆلەکە هەڵنیشتووەکانی سەر تەلەکانی کارەباو ئاوازی دەهۆڵ‌و زوڕنا تێکەڵ ببوون ..**

*** منالانیش لەگەڵ ئاوازی دەهۆڵ‌و زوڕناکەدا شانیان هەڵدەتەکان ..**

*** دەنگی شاباش دەهۆڵ‌و زوڕناکەی رادەگرت .**

*** وردە هەتاویش بەرەو ئاوابوون دەچوو .**

*** دەنگی تەقەی دەمانچەیێك هەموو دەنگەکانی قووتدا ، بووکەکەش پەلەخوود بوو ،و چۆلەکەکانیش هەموو هەڵفڕین .. »(٥) .**

وە هەروەها چیرۆکی « چارنووس » .. منالمان ناوێ .. جارێکیتر بە پەڕۆ ڕەشەکە هەزدوو چاومیان توند بەستەوە .. کورتە چیرۆکێکی ناتەواو ، خەوێکی هێمن ، پرد ، گۆشەیێکی ژیانی ڕەعنا .. » .

نموونەی ئافرەتی چەوساوە نیشاندەدەن ، کە هەمیشە لە زۆرانبازیدا لە دونیا پیاودا بۆ وە دەستی هێنانی مافی ڕەوای خۆی‌و دۆزینەوەی قەوارەی مرۆڤانەی ، هەروەها هەوڵدان بۆ بەشداریکردن لەگەڵ پیاودا بۆ بنیاتنانی دوارۆژێکی تازەو بەختەوەر .. یاخود بەکژا چوونی ئەخلاقیەت‌و نەریتی کۆمەڵایەتی چەوت سەبارەت بە چارەنووسی ئافرەت ... ئەوەتا کچە قارەمانی چیرۆکی « چارەنووس » ڕووبەڕووی کۆمەڵێك یاساو کوت‌و پێوەنی عەشایری دەبێتەوە کە دەیانەوێ ئافرەت وەکو ئاڵ‌و گۆڕکردنی شتومەك ئاڵ‌و گۆڕبکرێت‌و چەشنی کەل‌وپەلێکی بازرگانی هەرزان‌فرۆش بکرێ بەو کەسانەی شایستەی بیرکردنەوەدا ..

لەلایەکەوە دایکی کچە **« دەیەوێ شانازی بە نرخی شووکردنەوە بکات‌و لەناو پیرە ژنە گەوجەکاندا خۆی هەڵکێشێ باسی دیاری‌و زێڕو دینارو وەزیفەی زاواکەی بکات .. »(٦)** ..... لەلایەکی‌ترشەوە لەناو کۆمەڵ سەرپاکی ژیانی

لێ‌دەکەن بە کۆمەڵێك پرســــیارو دەبێ هـەر شـــــــووبکاتو چارەنووس ڕەت ناکرێتەوە ، ئەگەرچیش ئەم چارەنووســـە بێ‌ڕەزامەندی ئەو بێت .. **« ئەرێ تۆ کـەی شــــوو دەکـەی ؟ » « نســــــیب .. خوا دەزانێ ... خۆت ناڵێی شوکردن قسمەتو نسیبە »(٧) ..**

**چیرۆکی – منالمان ناوێ – وێنەیەکی دیکەی چەوساندنەوەی ئافرەتە لەلایەن کۆمەڵو پیاوەوە. ئەوەتا – نەسرین – لەبەر ئەوەی مێردەکەی داوای لێ‌دەکات مندالی نەبێت ، منالەکەی لەباری خۆی دەبات ، چونکە ئـەم داواکاریـەی مێردەکەی بۆ مندال نەبوون ئـەوە دەگـەیـەنێ ئافرەت وەکـو ئامێرێکی رابواردنـە هـەرکـاتێـك ویســــتی دەســــتبەرداری ببێتو تووڕیـدات ، تاوەکـــو منـدالەکەیش نەبێتە وەســــیلەیەك بۆ یـــەك بەستنەوەیان .. یاخود دووەم ئافرەتی چیرۆکەکە خۆی دەسووتێنێ لەبەرئـەوەی منـدالی نابێت ، گەرچیش وەختی بەدووی مێردەکـەی کـەوتووەو بێ‌ڕەزامەندی کەس‌وکاری شووی پێ‌کردوە » .. دیسـان چیرۆکی – جاریکی‌تر بە پەڕۆ ڕەشـەکە ، چاویلکە ، پرد ، یاداشت ، خەوێکی هێمن‌و کورتە چیرۆکێکی ناتەواو و بێ‌دەنگیەکی هەمیشەیی » . لە یەك باس‌و کێشــــە دەدوێن ، لەم چیرۆکانەدا پالەوانە ئافرەتەکـە دەکـەوێتـە مشــــتومڕ و مل‌ملانێ‌و بگرە و بەردە و دیســــانەوە پەرژێنێ لەنێوان بیروباوەڕیاندا دروست دەبێ ، « دلێر » بەهەمان بیرکردنەوەی نیمچە دکتاتۆریـەتی خۆی دەیەوێ رچەی بیرکردنەوەکانی بشکێنێ‌و بیکاتـە یەدەگ‌و تابیعی خۆی ، بەلام ئـەو جۆرە هـەولو تەقەلا ســـاردو سڕانە لـــە ئاســـتی ئافرەتێکی چاوقایم‌و بڕوا بەخـۆ بوو چ کەلکێك ناگـرن .. « دلێر » کە پالەوانە پیاوەکەی ئەو چیرۆکانەیە ، هەنـدێ‌جار مێردەو هەنـدێ‌جاریش دڵخـوازو هاوڕێ ، بەلام لە هەرسێ حالەتەکەدا هەربەکن و دەیانەوێ ئافرەتەکە بکەنە یەدەگ‌و تابعی خۆیان‌و هەمیشـە بە چاوێکی نزمەوە تەماشای دەکەن ..**

**« گـەر لێم‌بـدەن ئەقیژێنم .. ئەگـەرچی بـاوەڕم بەقیژەقیژ نییە .. بەلام ئافرەتی کوردی قوربەسەر چی‌بکات چی لەدەســتدێ بە قەپان هەوای دەدەنێ بـە ڕاســــتەو پڕگاڵ جووڵەکانی، دیــــاری دەکەن لـــە هەزار بازنەی هـەندەسیدا حەشاری دەدەن .. سەیرە باوەڕیشی پێ‌نەکەن .. ئەوا من دەزانم براکەم چەنـد درۆو فرتو فێـل لەگەل ئەم ئافرەتە بەستە زمانانەدا دەکات ، هەر نـاوێـرم هیچ بلێم چونـکە یەکســــەر دەلێ : ( من پیاوم .. ) »(٨) .**

پالەوان ئافرەتـەکـانی کۆمـەلەی « پرد » زۆرجاریش ئافرەتی رۆشنبیرو سـەرکێش‌و بڕوا ئەستوورن .. ئەوەتا لـە چیرۆکی « گوناهـەکانم یەکتر دەســــــووتێنن » . ئـەم چیرۆکە پارچە پەخشانێکی سفتو بەپێزەو بە زمانێکی شاعیرانە تەداعی پالەوانەکەیەتی .. ئافـرەتێکی بەتـوانـاو باوەڕ ئەستوورە ، دەربەستی ئەوەش نییە هەموو گوناهەکانی مرۆڤایەتیش بخەنە ئەستۆی. بەدووی ئەو کەسەدا وێلە کە ووشەکانی بۆ دەکاتە لایەلایەو تاوەکو ئەویش لەهەوێری برین‌و فرمێســــکەکانی کەرەستەیێکی بە پێز دروست‌بکات کە خێربەخش بێت بۆ ئادەمزاد ، چی ئەگەر رۆمان ، چیرۆك ، یان پارچە نووسراویکیش بێت .. هەمیشە لەگەل گەورەبوونی گوناهەکانیدا ، ســـنگی ئەو دەبێتە کەشتی‌و برژانگەکانیشی دەبێتە سەول بۆ پەڕینەوە بەرەو جیهانێکی نوێ‌تر و دوور لە برســــێتی‌و ئەشکەنجەو ئازارو کڕوزانەوەو خوێن ڕشتن .. گوناهەکانی بالدارن‌و بەرەو ئاســـــمانی پاك‌و بێ‌گـەردبی دەڕۆن ، . بـۆیـە دەیـەوێ دان بـە گوناهەکانیدا بنێت ، گەرچیش بێ‌گوناهە ، چونکە تەنیـا گوناهی ئـەو ئەوەیە ، ئافرەتی کۆمەلێـکی دواکەوتووە ، .. دانـان بەگوناهدا خۆی لە خۆیدا رێبـازێـکە بۆ تـەحقیق‌کردنی زاتی مرۆڤـانـەی خۆی .. چونکە ئەمیش وەکو کەسێکی رۆشنبیرو هۆشیار بۆتـە ئـاوێنـەی کۆمەلەکەی‌و هـەموو گوناهەکان لێوە سەرەتاتکێ دەکەن ..

**« گوناهە‌کانم لـە دەرگای هەموو مزگـەوتێ دەدەن ، شێخ عبدالقادر گەیلانی ، ئەبو حەنیفە ، عەتار ، رۆمی ، عەلی .. ئەچی لە بێدەنگی زیاتـر هیچ نابیستن »(٩) بۆیە لە ئەنجامدا : « – خۆیان برباڵیاندا خۆیان بسووتێنن »(١٠) .**

هەروەها قارەمــــانی چیرۆکی « شـەو » ، ئەگەرچی وەکو کەمەنکێش بـە دوو « ئامەرەش » دایانیەوە و ئێستا وەکو ســـێبەر لێ‌نابێتەوە ، چونکە – ئامەرەش – وەکو پاشماوێکی سەردەمی

رابووردوی کۆمەڵـەکـەی بۆتـە تلیاکو لەگـــەڵ خوێنەکەیدا دەژێت .. ئامەرەش‌و شـــەو دوو هێڵی هاوتەریب‌و دونیـای کۆمــەڵایەتی ئافرەتن بەکتر دەزێنن‌و ئەم کـەمـەنـدکێش دەکەن ، .. بەڵام سـەرەڕای ئەوەش دەیەوێ لـە تاریکیی ئـەو شەویش کەرەستەیەك درووست کات ، بۆئەوەی مناڵە رووتەکانی ئەم دونیایەی پێ بپۆشێت ...

یاخود کچە قارەمانی چیرۆکی « کەمان » وەکـــو ئەوانی‌تری پاڵـەوانـەکـانی کۆمەڵەی « پرد » ، ئافرەتێکی هۆشمەندو رۆشنبیرە ، ســــەراپـا ئێش‌و ژان‌و نەزیف‌و فرمێسك‌و بێ‌دەنگیی‌و برین‌و هەزارە پرسیاری قوقزی مرۆڤایەتی بـە کۆڵـەوە گرتووە ، بە هەموو کۆڵان‌و شەقامەکانی دونیـــادا دەیانگەڕێنێی‌و لەگەڵ هەموو ئازارو برســـێتی‌و قاوقیژو دەردەسەریی‌و عارەق‌و سنووقی منـاڵـە بویاغچیەکان‌و ژیانی رۆژانەی ماڵەکانی ســــەنەك‌و بەغاو غەوس‌و چوار دەوری ئەبوو حەنیفەو جنێدو رۆمیی‌و عەتار و حەلاج‌و مزگەوتی گەورەی سلێمانی‌و باخانەی کوێرەکـان قـەڵای کـەرکوك‌و ئـەلوەنی خانەقین‌و کچولە پێ‌پەتیی‌و هەزارە گەرەکەیان‌و تا دەگاتە گۆی زەوی ، بەیەکەوە دەبەستێ و لـــە گلێنەی چاوەکانی خۆیدا دەیان پاراستێ‌و بە رۆژ دەیانســـــوورێنێتەوە ، تاوەکـــو هەتـاوێـکی‌تر دەدۆزێتەوە ، هەســـت بە ماندووبوون ناکات ، گەرچیش دڵنیایە کـە بەم زووانە ئـەو هـەتـاوە وەدەست ناهێنێ بەڵام هەروەکو « ســـیزیف » ووره بـەرنادات .. ئـەم هـەموو رازو نیـازەش دەچێنێ بەگوێ ئامێری کەمانێکەوە ، کە لە سـەر مێزەکەی بەردەمیدا لە ژووره تەنیاکەیدا ئۆقرەی گرتووە .. بەڵام سەرەڕای ئەم هەموو هۆشاریی‌و خۆ خواردنەوەو موعاناتە ، رووبەرووی ژیـانـــە رۆتین‌و پرســـیارەکان دەبێتەوە ، هەوڵ دەدرێ کەمەندکێش بکرێ‌و مرۆڤایەتی خۆی لەدەســـت بدات‌و هەروەکو کچی عالەم شـــووبکات بەس‌و بێتە خـاوەن مێـردو منـــاڵ‌و ببێتــە مرۆڤێـکی میکانیکی .. بەڵام ئەمیش ســـەرکێشەو نایەوێ وەکو دەستە خۆشکەکانی‌تری ، پیاو بە ئۆتۆمبیل‌و پارە هەڵخەڵەتێ‌و خوی فریو بدات نێو ژیانێکی ووشـــك‌و میکانیکیەتی دەوروبەرەکەیەوە ، چونکە گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە بەختیاری لـە ژن‌و مێردایەتیدا لە مسۆگەرکردنی پێداویســـــتەکانی ژیان نییە ، بگرە لەیەك گەیشـــتن‌و خۆشەویستی دروستکردنە ، .. ئەم مەرجەش لـە کۆمەڵێکی دواکەوتوو لە رووی ئابووریی‌و کۆمەڵاتیەوە هەرگیز وەدی نایەت ، چونکو نەریت‌و عادات‌و ئەخلاقیەتی کەسانی کۆمەڵ بەوانەوە بەندن .. ئەوەتا ئافرەتە داروسێکەیان بە رەوەڵەیەك مناڵەوە ، گشـــت شەویکیش مێردەکەی بە ســـەرخۆشی دێتەوە ، یاخـود ئـەو ئافرەتەی لـە چیـرۆکی « خەوێکی هێمن » دا وێڵەو سەرگەردان لە شەوێکدا هەندێ پیـــاو هـەڵیـدەخـەڵـەتێن‌و ئـاوارەی کـۆڵان‌و شەقامەکانی دەکەن ، یان ـ نازەنین ـ ی خۆشکی کچـە قارەمـانی چیرۆکی « چارەنووس » هەموو رۆژێك لـەگـــەڵ مێردەکەیدا دەبێتە دەمەقاڵیان‌و دەتۆرێ ، چونـکە ژن‌و مێـردایـەتیـان ئەنجامی

چاوبازیەکی سەرپێی دەبێت‌و مێردەکەیشـــــی بەهەزار قەرزو قۆڵەو دەســـتبڕین مارەییەکەی

پەیدادەکات .. وەهەزارەها ئافرەتی‌دی کـە بە بێ دڵیی خۆیان‌و هۆیێکی بازرگانی بەمێرد دراون .. بۆیە زۆربەی پاڵەوانە ئافرەتەکانی چیرۆکەکان لەو تەجروبەیە دەترسن‌و راوەکەن ...

**« ـ ئای کەمـان**

**چەند بێ ناز لە ســـەر ئەم مێزەی بەردەممدا ئۆقرەت گرتووە .. تۆیش دەروونت وەکـــو من پڕی پرسیارەو دەتەوێ من ئاسا پرســـیارەکانت تووشی نەزیفت بهێنن ؟ تۆ بە ناڵەو من بەخوێن .. من بەرەو خوار خوێنم دەبێتە تافگەو تۆیش بەرەو ژوور ناڵەت دەبێتە گـەردەلول .. نـازانم تۆیش بێزار دەبی .. تۆیش وەکو هەموو کەسێ دەتەوێ ناڵەی تەلە بەســـۆزەکانی دەرپەڕێنی‌و خەڵکی‌تر گوێگرت بن .. نازانم هەندێ گوێم لێ‌دەگری باشە ئەر گوێم لێ‌بگری باسی چیت بۆ بکەم ؟**

*** ئەوانەی پێستیان رەنگاو رەنگە ..**

*** ئەوانەی لەگەڵ بێ‌گرتنیان ئەرکی خێزان بەخێوکردن لە ئەستۆیانە .. ؟**

**ئەوانەی درۆدەکەنو شەوان لـە شـــەقامو بارەکاندا جگەرەی تاك دەفرۆشن ؟**

**ئەوانەی لە بەرچاویاندا باوکو براو دایکیان کوژراون ئەوانە ( صلیب الاحمر ) نان ، شـیر ، ئاویان ، دەداتێ ؟**

**ئـەوانـەی بـاوکو دایکیـــان هـــەژارەو دەیانفرۆشن ؟ ))(١١) .**

دیسانەوە لە چیرۆکی « ســـــەرەتایەك بۆ نووســـینێکی نوێ » دا روو بـە رووی ئافرەتێکی رۆشنبیرو رۆژنامەنووس دەبینەوە ، کـە تووشی هەمان گێرمەو کێشەو رۆتین دەبێتو ناتوانێ خۆی لەو کۆتو پێوەنە قورســـــانەی دەوروبەرەکەی رزگارکـــات ، تەنیا بیرکردنەوەو خـــەم خواریی نەبێت ، لەبەرئەوەی ئافرەتی دەوروبەرەێکە کـــە هیچ دەسەلاتێکی تێدا نەماوە بۆی لـە دونیـــــای پیاودا و هەمیشـە لـە قســـەو توانجو واتەواتی خەڵکیی ناتوانێ خۆی رزگارکات ، ســـــەرەرای ژیان رۆتینەکەی :ــ

**هــەمــوو رۆژێ ! ( بەیانتیان باشـــا چۆنن تەنوورەکەت جوانە تەسریحەی پرچەکەت.. دایکی فلان ، نـەرێ کچەکـەتـان چۆن بوو .... لـــە دواییشدا ئەگەر بەنووکە قەڵەمێ ، چیایێك نەکەن بە نیسك ئەوا نیسـکێ دەکەن بە پیرەمەگروون ÷ بەرتیـلو ریاییو مەلیۆن روویی و پینەکردن ))(١٢)**
یان روو بە روو بوونەوەی پرسیارە هەمیشـەیەکەی دایکی : بۆ شوو ناکەیت .. ؟ بەلاّم ئەم قســـانە لەمەڕ ئەودا پشتگوێ دەخرێ ، چونکە مەسەلەکە ململانێی نێوان دوو سـەردەمی جیاوازن ، نێوان رابووردوی دواکەوتوو ئێـستای پڕ لـە ئاڵوگۆڕی ناوخۆییو دەرەوەی ، بۆیە مل بۆ توانجو بۆڵەبۆڵی دایکی ناخەوێنێو هەمیشـــــە لەگەڵ سەزکێشی خۆیدا رێگای گرتۆتەبەر و دەیەوێ بە نووسینیش بێت ، زاتی مرۆڤـانـەی خۆی ئەنجام بدات .. « دایکم راســــــت دەکات زۆر دەنووسم بـەلاّم چیدەنووسم یا چیم نووسیوە ، نـازانێ هەرچیم نووســـیوە نرخی لاپەرەیێکی دۆستۆیفســـــکیو ئەندریە جید و کونســـــــتاتنیانو جوێس نییە ، ئەگەرچی پێم دەڵێن :ــ سەرەتای نووســـینەکانی جۆرج صــــاندو فرجینا وولفو فروغ فروخزاد وەکو تۆ بووە .. »(١٣) .

## پەراوێزەکان :

١ ــ کۆمەڵە چیرۆکی پرد .
٢ ــ مجلة الاداب الاجنبية .
٣ ــ کۆمەڵە چیرۆکی پرد .
٤ ــ کۆمەڵە چیرۆکی پرد .
٥ ــ کۆمەڵە چیرۆکی پرد .
٦ ــ کۆمەڵە چیرۆکی پرد .
٧ ــ هەمان سەرچاوە .
٨ ــ هەمان سەرچاوە .
٩ ــ هەمان سەرچاوە .
١٠ــ هەمان سەرچاوە .
١١ــ هەمان سەرچاوە .
١٢ــ هەمان سەرچاوە .
١٣ــ هەمان سەرچاوە .
١٤ــ قضايا الرواية الحديثة .
١٥ــ الموسوعة الصـــغيرة ــ صـــنعة الرواية ، ترجمة : سامي أحمد .
١٦ــ موحازەرەیەك دەربارەی چیرۆك لـە سلێمانی ( طه بابان ) .
١٧ــ عشر روايات خالدة سۆمەرست مۆم .

# ئاوڕێک لە لاوکی گەنج خەلیل

زیاد محمد امین

زۆر شــــوڕەســـواری چاپووکو چالاک لە مەیدانی خۆشەویستیو دلّداریدا ســـــەرانگرێ بوونو ، زۆر دلّشـــــکێنراونو ، زۆر جووتەش لێکدابڕاون .

ئایشەگوڵ هەتا مرد ، چاوی بە فرمێســکی لەســــەر ڕێبازی گەرمێنێ هەلّنەگرتن کەچی چووکە لە سواری شەڕی (( لە حســـا ))یە هــەر نەگەڕایەوە .

ئەدی ، سیامەندە لاوی بێداکو باب ، چۆن لە چیای سیپانێ بیستو دوو پەلی دارەبەنێی بــە قەپرغانــدا چوونو بــە ســــــووری ماهیەوە هەلاوەسرا .... ! ، ئامۆزا خەجێش چۆن خۆی بۆ فڕێدایە خوارێو ! ئەویش بە مەرەدی وی بەو هەویقەیەوە بە جووتە پێکەوە گیانیان دەرچوو !

ئێســـــتاش ئەوەتا گەنج خەلیل لە وولاتێ غەریبیان نەخۆشەو سەری لەسەر ڕانی حەوسەتێ ئامۆزاو خۆشەویستەو لەشو گیانیشی خەریکە لە یەکدی جوێ دەبنەوەو ، حەوسەتیش ســــەری بەسەردا ژەنیوەو ، لە تاوان هەناوی هاتۆتە کوڵو بێدەسەلات فرمێسکانی بەسەردا هەلّدەوەرێنێ .

جا ، ئەم داستانە کەلەپوورەمان وەک لە لاوک بێژان بیستراوە بەم شێوەیە دەستپێدەکات :

**لاوکی گەنج خەلیلو حەوسەت**

حەوسەت سبەینێ لە خەوێ ڕاســـــت دەبێتەوە(١) گەردی بەیانی‌یە(٢) .

* * *

گازدەکا ، دەلّێ : « دایە ، بەو خودایەی‌کەم لە ژووری ســـــەری‌یە ، ئەم شەوی ڕادەبرد ، خەونێکی ئەلێک گەلێک ســــــەیرم دەدی‌یە » .
دەوەرە لێ‌لێ ........

* * *

داکی دەی‌گوت :
« خەونێ تۆ سفەتی « قل هو الله » بێ ،
« کەلیمەی « لا إله إلا الله » بێ ،
« یوسف « صـدق »ی لێدابێ ،
« بۆ دوژمنی بەشەڕ گەڕابێ ،
« بۆ خۆمان بەخێر گەڕابێ ،
« ڕۆلە ، حەوســـــەتە ، لە خەوێدا دەبێ چ ڕووی دابێ ؟ » .
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

حەوسەت دەی‌گوت :
« دایە ، لە خەوێدا لەمن وابوو ،
ســپی دارێکی بلّنـد لـەبـەر دەرکێ مـالّـە ئاوەدانەکەی بابی من ڕوابوو ،
« سەری ئەوێ سپی‌دارێ سیو دوو ڕەشماری لێ ئالابوو ،
« لە نێو ئەوان ڕەشماران جووتێکی چرا پێوە کرابوو ،
« لەبەر چرایان جووتێکی فنجانی فەخفوری لێ چەسپ کرابوو ،
« لە دامێنێ ئـەوێ ســــــپی‌دارێ مێـرگو مێررغوزارو مەزرابوو ،
« کەرێکی گولی پشـــت کرمێی تێدا بەرەلّلا کرابوو ،
« لەوبەری سپی‌دارێ کەوێکی دەنگ‌خۆش بــە دلّتــەنگی دەی خوێنــدو گرۆلّێکی(٣) داوی شیرداخی(٤) لە دندووکێ ئالابوو » .
دەوەرە لێ‌لێ .......

* * *

داکی دەی‌گوت :
« ڕۆلّە ، خەونێ تۆ ڕاستەو بێدرۆیە .
« ئەگەر نازانی ، ئەو سپی‌دارە بەژنی تۆیە !
« ئەو سیو دوو ڕەشمارە سیو دوو کەزیەێ تۆیــە ،
« ئەو جووتە چرایە ، جووتە چاوێ تۆیە ،

◁

« ئەو جووتە فنجانە ، جووتە مەمکێ تۆیە ،
« ئەو مێرگ‌و مێرغوزارە ، شـــیکە بەدەنێ تۆیە ،
« ئەو کەرە گولە پشت کرمێیە ، حوســـێنی زەنگی دەسگیرانی تۆیە ،
« ئەو کەوە دەنگ خۆشـــەی بە دڵتەنگی لەو بەری ســـپی‌داری دەی خوێندو گرۆڵێکی داوی شێرداخێ لە ندووکێ ئالابوو ، ئەوە گەنج خەلیل ئاغایە کوڕە مامێ تۆیە » .
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

داکی دەی‌گوتەوە
« ئەگەر نازانی ، ئامۆزای تۆ گەنجۆیە ، گەنج خەلیـــل ئاغـــایـــە ، کــوڕی ئەحمەد ئاغای بێلەجووکی‌یە .
« بێ‌سەداو ســـۆراخە ، نازانم : نـــەمـــاوەو نەمردی‌یە » .
وەرە لێ‌لێ ......

* * *

حەوسەت دەی‌گوت :
« دایە بەو خودایەی‌کەم لە ژووری سەری‌یە ،
نە لە ڕەنگی کەسەو نە کەسی لەرەنگی‌یە ،
« سبەینێ دەچمە سەر ڕێ‌یە ، دادەنیشم بـــە عەینی‌یە ،
« دەپرسم لە کاروانچیان . لە ڕێبواران ، لـــە وولاّخ‌داران ، بەڵکی خەبەرێکی بەڕاستی لە ئامۆزایـــە خۆم بزانم ، داخۆ ماوە یـــانـــە ــ مردی‌یە » .
وەرە لێ‌لێ ......

* * *

حەوسەت سبحەینێ سەحەری دێتە ســـەر ڕێ‌یە ، دادەنیشێ بە عاجزی‌و غەمباری‌یە .

زەینێ خۆ دەداتە دووری ، دەبینێ لە دیارو نەدیاری ، کاروانێك دێ نـــە ســـــــەری دیارە نەبنی‌یە .

کاروان دێتو ڕادەبری ، لە دوا کاروانێ‌دێ ، سوارێك ، بەسەر حەوسەتێوە ڕادەوەســـــتێ‌و دەڵێ : « کیژێ ، ئەمن نازانم بەو بەیانەی کـــارو فەرمانت لەسەر ئەوێ ڕێبازێ چی‌یە ؟! » .

حەوسەت دەی‌گوت :
« کوڕە ، ئەتۆ نازانی ئەمن ئەم شەو خەونێکم بە ئامۆزایە خۆمەوە دەدی‌یە !
« بۆیە هاتوومە سەر ڕێبازێ‌و دانیشتووم هەتا بپرسم لە کاروانچیان ، لە ڕێبواران ، لـــە وولاّخ‌داران ، بەڵکی لە کەسێکی بەدەســـتم کەوێ خەبەرێکی ڕاستێ‌یە ،
« داخۆ ئامۆزایە من ماوە یانە ــ مردی‌یە » .
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

سوار دەڵێ : « کیژی ، ئەمن نازانم ئامۆزایە تۆ کی‌یەو کێ نی‌یە ؟! » .
حەوسەت دەی‌گوت :
« ئەگەر نازانی ، ئامۆزایە من گەنجۆیـــە گەنج خەلیـــل ئاغـــایـــە ، کوڕی ئەحمەد ئـــاغـــای بێلەجووکی‌یە .
« ئەو ساڵە کە حەوت ساڵە لە شاری شـــامێ سەرکردەی لەشکری‌یە ،
« بێ‌سەداو ســـۆراخ ڕۆیشتووەو هیچ خەبەرم لێ‌نی‌یە .
« ئەمن نازانم ماوە ــ بەمان ، یانە ــ مردی‌یە »
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

سوار دەی‌گوت :
« کیژێ ، ئەمن چاکی دەناسم ، لەو ڕۆژانـــە لەشاری شامێ کاروانم بۆ بار کرابوو ،
« کاروانم لەشـــــــــاری وەدەردەناو بۆخۆم دەگەڕامـــەوە بۆ نێو بـــازاڕی ، کـــە چووم کوچەبوو ، لەوی کوچەی کۆمەڵێکی پیاوانی لێ‌ڕاوەستابوو ،
« کە دەمڕوانی ، مردوێکیان لەبەر دەســـتان درێژ کرابوو ،
« لەســـــەر تاتەشـــــوارێ ، هێنابوویانە بەر شتنێ‌و خەڵکێکی زۆری لە دەورە ئالاّبوو ،
« ئەمن زەینم دەدایە مەیتی ، دەتگوت کافووری سپی‌یە ،
« بە مەخسووسی دەم پرسی : ئەو مەیتە کێ‌کە، کێ‌نی‌یە ؟!
دەیـــان‌گوت :

« ئەگەر نازانی ، ئەوە مەیتێ گەنجۆیە ، گەنج
خەلیل ئاغایە ، کوڕی ئەحمەد ئاغای
بێلەجووکی‌یە ،
« ئەو ساڵەکە حەوت ساڵە لەشاری شامێ
سەرکردەی لەشکری‌یە ،
« قەدەرێکە نەخۆشەو ئەمڕۆ ئەمرێ خودای
دەکردی‌یە ،
« کیژێ ، بەوێ خودێکەم لە ژووری
سەری‌یە ،
« بێ فایدەیە ئەو ڕاوەستانو ڕێگری‌یە ،
« ئامۆزایە تۆ بەمان ــ نەماوەو مردی‌یە » .
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

حەوسەت هەڵدەکێشێتە پشووی گرینێ ،
دەست دەکاتەوە بە قوڕ پێوانێ ، بەشینێ ،
دەی‌گوت :
« بڕۆ سوارە ، ڕەبی ئەگەر نانت هەبێ دۆت
نەبێ ،
« ئەگەر دۆت هەبێ نانت نەبێ ....
« ڕەببی سوارە ، ئەگەر ئەتۆ گەنمی دەچێنی ،
شیلەو گرگوێی لەبۆ تو بێنی .
« ئەگەر ئەتۆ برنجی دەچێنی ،
داڕووجانی لەبۆ تۆ بێنی .
« بۆ خەبەرێ ئەگەر داتە منی مل بەکوێنی .
« ڕەببی سوارە ، خەنجەرێ خۆت لێ بە
دوژمن بێ ،
« ڕمبێ خۆت لێ بە دارەمەیت هەڵگرتن بێ ،
« شەدێ(٥) خۆت لێ بە کفن بێ ،
« بە تیرێ سەر بە پەیکانت جەرگ کونکونبێ ،
« ئۆباڵێ منی قەڵەندەرت لە گەردن بێ » .
دەوەرە لێ‌لێ ......

* * *

حەوسەت لەوێ شەرەڕێ‌یە دەست
دەکاتەوە بە گری‌یە . زۆری پێ‌ناچی سوارێکی
دی ــ دێ ، بە سەر حەوسەتێوە رادەوەستی‌یە
دەڵێ : « کیژی ، ئەمن نازانم ئەو شینوگریانو
قوڕپێوانەت لە بەرچی‌یە !؟ » .
حەوسەت دەڵێ :
« کوڕە سوارە ، پێشی تۆ سوارێك دەهاتو
ڕادەبردی‌یە ،
« ئەمن خەبەرێ کوڕە مامێ خۆم
لێدەپرسی‌یە ،
« دەیدایەوە بە منی قەڵەندەر خەبەرێکی
بە سەحی‌یە .
دەی‌گوت :
« کیژێ ، بەو خودایەی‌کەم ڕەبی‌یە ،
کوڕە مامێ تۆم بەمان ــ نەماوەو مردی‌یە » .
وەرە لێ‌لێ ......

* * *

سوار دەی‌گوت : « کیژێ ئەمن نازانم کوڕە
مامێ تۆ کێ‌یەو کێ نی‌یە !؟ » .
حەوسەت دەی‌گوت : « ئەگەر نازانی ، کوڕە
مامێ من گەنجۆیە ، گەنج خەلیل ئاغایە ، کوڕی
ئەحمەد ئاغای بێلەجووکی‌یە .
« ئەو ساڵەکە حەوت ساڵە لەشاری شامێ
سەرکردە باشی لەشکری‌یە » .
سوار دەی‌گوت :
« کیژێ ، بەوێ خودێکەم لە ژووری
سەری‌یە ،
« ئەو سوارە شێتە ، نەفامە ، ئاقل ناچیزەیە،
هیچ ئاگای لەخۆ نی‌یە .
« ئەمن چاکی دەناسم ، گەنج خەلیل ئاغای
کوڕی ئەحمەد ئاغای بێلەجووکی‌یە .
« لەو ڕۆژانە دانیشتبووم لە بازاڕی شاری
شامێ لە محەللەی سالحی‌یە ،
« دەمدی قاسیدێك دەگەڕا زۆر بە
گورجی‌یە ،
« ئەمنیش بە مەخسووسی لە قاسیدیم
دەپرسی‌یە ،
دمگوت : قاسید ، کاروفرمانت چی‌یە ؟
قاسید دەی‌گوت :
« ئەگەر نازانی دەگەڕێم لە قاشێك شووتی‌یە !
« بۆ گەنجۆیە ، گەنج خەلیل ئاغایە کوڕی
ئەحمەد ئاغای بێلەجووکی‌یە ،
« قەدەرێکە بەبێ خواردنو خواردنەوە
نەخۆشی نێو نوێنی‌یە ،
« ئەمڕۆکە تۆزێك چاکترەو ئارەقی
دەرکردی‌یە ،
« کیژێ ، بەو خودایەی‌کەم لە ژووری
سەری‌یە ،

« چیدی مەکە دادو فیغانو گریە ،
« ئامۆزایە تۆم ماوە ـ بەمانو نەمددیە » .
ئەگەر حەوسەت ئەو قسەی بە بەرگوێی دەکەوتیە ،
دەستی دەبردە گەردنلغی دانە بیستو چواریە ،
ووردە ووردە دانەی دەپچڕین لە گەردنلغیە ،
دەیدانەوە بە سواری لە باتی مزدێنیە .
وەرە لێلێ .......

* * *

حەوسەت دەیگوت :
« کوڕە سوارە ئەمن وا ناکەم ،
« کوڕە مامێ خۆم سەوداکەم ،
« دەستێکی جلی ئەمەر قوپانی بە بەرداکەم ،
« جووتە چەکمێکی زەرد مووسلی لە پاکەم ،
« خەنجەرێکی نێرۆیی لەبەر کەمەرێ ڕاکەم ،
« شیرێکی قەرەمیسری بە تەنیشتێداکەم ،
« ڕمبێکی هەژدە قەفی تۆپڕەشی بە قولەمێ(٦) داکەم ،
« ئەسپێکی کوێتی قاپڕەشی بۆ پەیداکەم ،
« زینێکی مورسایی قایشێ هەمەدانێی بۆ لە پشتێ چاکەم ،
« سەرزینێکی لە تولکو پەڕی نەعامێ بۆ بە سەر ـ زینیدا کەم ،
« لغاوێکی دانە مرواری بۆ بە سەری کوێتیدا کەم ،
« گەنجۆیە کوڕە مامێ خۆم بێنم سوار کەم ،
« جا تێرتێری چاوانی لە بازاڕی شامێ تەماشاکەم » .
دەوەرە لێلێ .......

* * *

حەوسەت دەبێژی :
« یارەبی دلێ من گەلێك والە(٧) ،
« گەنج خەلیل ، کوڕە مامێ من لە وولاتی غەریبیان گەلێك نەخۆشە ئەمن نوێنی ڕایەخم قەدقەدی بە ژنێ خۆ بدەمە پالە ،
« کەمەرەی خۆم بشکێنم بۆ ئەسپی گەنج خەلیلی بکەمەوە نالە ،
« بازنێ خۆم بشکێنم بۆی بکەمەوە ووردە بزمارە ،
« بسکێ خۆم ببڕم بۆی بکەمەوە سەرڕەشمەو دەست هەوسارە ،
« بێنم گەنج خەلیلی سوارکەم لە کوێتێکی تالە(٨) ،
« بە ناو بازاڕی شاری عوسمانلیەدا بێتە خوارێ ، جا ـ کە ـ چووە مەیدانێ ـ کوڕە مامێ من ـ ناکەس نەبێژن سوارێکی کوردە چەندی بێ‌کاروبارە » .
وەرە لێلێ .......

* * *

حەوسەت ئەوەی دەگووتو دەگێڕاوە بەرەو دواوە ،
لە سیو نۆ دەستە خوشکی خۆی دەگێڕاوە ،
دروستی دەکردن چل دەستە جلی پیاوە ،
چل وولاخی ڕەسەنی دەکردن زینو لغاوە ،
بۆ خۆی دەبۆوە گەورەو سەرکردەیانو بە پۆلە سوار ڕوویان لە شاری شامێ دەناوە .......
وەرە لێلێ ....

* * *

لە شاری شامێ دەیان پرسی : مەنزلێ گەنج خەلیل ئاغای لەکوێیە ، لەکوێ نیە ؟
پێیان دەگووتن :
« ئەگەر نازانن مەنزلێ گەنج خەلیل ئاغای لە گەرەکێ سالحیە ! » .
سوار دەگەیشتنە بەر دەرکێو ، لێیان وەردەگرتن جەلەوێ وولاخیە .
دەچوون وەسەر دەکەوتنو دەبوونەوە میوان لە دوو ـ نهۆمو بلندیە .
دەیان دیت نەخۆشێك ڕاکشاوە زۆر بە نەجیبیە ،
نەخۆشی هەندێکی کەسو دۆست لەدەوریە .
وەرە لێلێ .......
سەلام سەلامی میوانان دەبوو بلاوە .
نەخۆشی لێفەی لەسەر چاوی خۆی هەلدەداوە ،
بەڕوو خۆشی عەلەیکی میوانانی دەداوە .
دەیگوت :
« میوان بەخێرێن سەر هەردووك چاوە » .
دەتگوت لەوەپێش خەبەریان پێداوە ،

خۆشی‌یە کچە مامێ لە دڵی گەڕاوە .
دەوەرە لێ‌لێ .......
★ ★ ★
دەی‌گوت :
« میوان بەخێرێن‌و خێر هاتی‌یە ،
« سەرکردەی ئەوان میوانان هەر وەك کچە مامێ من دەچی‌یە » .
حەوسەت دەڵێ :
« کوڕە ، ئەتۆ زۆر نەخۆشی‌و هیچ ئاگات لە خۆت‌نی‌یە ،
« کچە مامێ تۆ لە وولاتی کوێستانێوە ، کاری بەوی وولاتەی چی‌یە ؟! » .
گەنج خەلیل دەی‌گوت :
« ئەمن ئەو قسەم هیچ پێ‌ڕاست نی‌یە .
« با بێتە پێشێ سەری بکەمەوە سەر ڕانی‌یە ،
« ئەمن دوعایەکەو لەخۆم کردی‌یە ،
« پاش سەرکردنە سەر ڕانی حەوسەتێ ، بەسمەو نامەوێ چیدی زیندەگی‌یە » .
دەوەرە لێ‌لێ .......
★ ★ ★
حەوسەت دەچوو بارگێ خۆی هەڵدەپچڕی‌یە ،
لەبەر خۆی دەکرد ، کراسێکی خامەکی وشکەخارای ئەتڵەسی‌یە .
بە شل‌وملی دەهات‌و لە پێش گەنج خەلیلی ڕادەوەستی‌یە .
گەنج خەلیل چاوی بڵند دەکردو بەغەریبی دەگری‌یە .
نەفەسێکی لە قەلوونی خۆی دەکێشی‌یە .
وەرە لێ‌لێ .......
★ ★ ★
حەوسەت دەبێژی :
« قەلوونێکی بۆ کوڕە مامێ خۆم لە توونتێ ژەنگاریێ دابگیرێنم ،
« قەلوونی زێر نیشانە ، باسکی ئەستەمبولە ،
مۆدینی(٩) کارەبایە ، پەلێکی داری داربەڕوو بێنم ، بە مشاری ببڕم ، بە مەورەدی قەرەدانی دابێنم ،
« وردە وردەی بە ئاگری بسووتێنم ،
« ئەو پشکۆیەی لەسەر قەلوونی گەنج خەلیلی کوڕە مامێ خۆم دانێم‌و دای‌بگیرسێنم » .
وەرە لێ‌لێ .......
★ ★ ★

گەنج خەلیل دەی‌گوت :
« توو خواکەی ، ئەتۆ دانیشە ، جا ئەمن سەرێکت بکەمەوە ڕانی‌یە ،
« هەتا بە دڵیم دابێ تەزوویەکی سێبووری‌یە »
حەوسەت دادەنیشت‌و لەسەر ڕانی خۆی دادەنا سەری گەنج خەلیلی‌یە .

پاش سەعاتێکی گەنج خەلیل عەمری بە جێ‌دەهێشت بۆ گوادێرو حازری‌یە .

دەوەرە لێ‌لێ ....... وەرە نەمایە ، پاشی گەنج خەلیلی کوڕە مامێ خۆم نەمینم لە دنیایە .

**لێکدانەوەی وشەکان:**

١ ـ **ڕاست دەبێتەوە : هەڵدەستێ .**
٢ ـ **گەردی بەیانی : بەیانی زوو .**
٣ ـ **گڕۆڵە : تۆپەڵ .**
٤ ـ **شیرداخ : ئاوریشم .**
٥ ـ **شەدە : مشکی .**
٦ ـ **قولەم : ناوپەلی دەست ، کاتێك کە پەنجە دەنووشتێنەوە بۆ گرتنی شتێك .**
٧ ـ **والە : وێڵ‌و شێواو .**
٨ ـ **کوێتی تاڵە : کوێت : ئەو ئەسپو مایناکەن کە ملك‌و یاڵیان ڕەشن . بەلام تاڵە (( تاڵە )): ئەو وولاخە بەرزانەن کە ڕەنگیان ڕەشێکی تاڵە . هەمان ڕەنگ (( تاڵە )) بۆ گوێ درێژ پێی دەگوترێ دێز .**

٩ ـ **مۆدین : مۆدنە : مووروویەکە بە کۆتایی باسکە قەلوونیەوە دەکەن ، دەمی پێوە دەنێن بۆ مژ لێدان .**

**سەرچاوەکان :**


١ ـ **شرینێکی حەیران‌و لاوك بێژ کاوێس ئاغا .**
٢ ـ **شرینێکی حەیران‌و مەقام بێژ خدر بلوێر .**
٣ ـ **شرینێکی حەیران‌و مەقام بێژ سەلیمی بایزی .**
٤ ـ **تحفەی مظفریە بەرگی دووەم .**

# هۆزانەکا کاتبێ قوباد بەگێ میرێ ئامێدیێ

عبدالرحمن مزوری

دەمێ ئەم بەرپەرێن میرگەها بادینان ڤەددەین ، گەلەك میر بناڤێ [ قوباد بەگێ ] بەرچاڤ دکەڤن .. لێ بهزرا من ئەڤە قوباد بەگ کورێ سلطان حوسەینێ وەلی‌یە ، ئەوێ دناڤبەرا ١٥٦٦ – ١٥٧٤ ز پشتی مرنا باڤێ خو ، بویە میرێ بادینان .. ئەڤ هزرە دجهێ خودایە ژ بەر کو یەکەمین قوبادە ، وناڤ دەنگێ وی حەتا نهو پتر ژ ئەڤێن دی هەمیان بەلاڤبویە .. لەورا دەستنڤیسا مە گوتی‌یە : [ کاتبێ قوباد بەگێ ] تبنێ وپێدڤی ناکەت بێژیت : [ .. یێ سێ یان یێ چارێ ] .. دیسان ئەڤی گەلەك حەژ هۆزانێ ڤەهاندنێ دکر ، لەوا حەمکێ توڤی کریە دەنگبێژێ دیوانا خو ، مینا مێژوڤان ئەنوەر مائی نڤیسی .

ئەڤ هۆزانە ژ ڤەهاندنا [ ئەحمەد ناڤەکی‌یە ، کاتبێ قوباد بەگێ‌یە ، ونازناڤێ [ کاتب ] ژی لدیماهیا هۆزانا خودا ئانی‌یە .. ئەڤ هۆزانە ددەستنڤیسەکا دیوانا جزیری‌دا کو هۆزانڤان طاها مظهر مائی گەهاندی‌یە دەستێ من لەرێ هۆزانێ نڤیسی‌یە : [ احمد کاتب قباد بگ دەبێژیت ] .. دیارە ئەڤ دەستنڤیسە جارەکێ کەتیە ددەستێ مێژوڤان ئەنوەر مائی ژی‌دا ، لەوان ئەوی دفەرۆزا هۆزانا ناڤبریدا مالکەك زێدەکری‌یە ، دجهێ خودا دێ دەستنیشان کەین ..

بەری ئەم هۆزانا ئەحمەد کاتبی دانینە بەرچاڤ ، مە دڤێت بێژین هۆزانڤان [ رەمەزان بۆتی ] هۆزانەکا وەسا ڤەهاندی‌یە ، وەکی رەنگە هەڤرکیەکێ یان بزارڤەکرنەکێ یان بەرێکانیەکێ ئەڤ رەمەزان بۆتی‌یە کی‌یە .. ؟! مە نیازە

گۆتارەکا سەربەخۆ لســــەر بنڤێین .. نهو هند دبێــژین ئــەڤی هۆزانــا مــەلائی جزیــری ئــەوا دبێژیت :

**ئەی نەسیمێ ســبەهێ ما دمەجــالا ســـەحەرێ**
**سەد سەلامان بگەهینی ، ژ مە وێ لەب شەکەرێ**

شــەش مالکی کــری‌یــە ودهــەمی دیوانێن چاپکریێن جزیری(٢) هەیە .

براستی گرڤێن موکم بدەست مە نەکەتینە بزانین ، رەمــەزان بۆتی یــان ئــەحمەد کــاتبی ، بەریکێ هۆزانا خــو ڤەهاندی‌یە .. کێ بزاری کێ ڤەکری‌یە ؟! بەلکو حەتا ئەم نزانین کی بەری یێدی ژی‌یە .. ؟! ئەڤ هۆزانا [ بۆتی ] هێژا محمد فؤاد بامەرنی گەهاندی‌یە دەســـتێ مە .. هۆزان بتنێ لسەر پەرەکێ نیڤ دریای هاتیە نڤێسین ، لسەرێ پەرێ گۆتی‌یە : [ رمضان جزری فرماید ] ، ناڤێ هۆزانڤانی دناڤ مالکێن ویدا نەهاتیە .. نەدویری ناڤێ وی [ دەوران ] بیت لەوان دمالکا دیماهیێدا گۆتی‌یە : [ وان إبن دەورانە غَرَضْ ] .

( ١ )

## هۆزانا ئەحمەدی کاتبێ قوباد بەگێ

**چەشمێن دشـــــەهلا ، وان ضـــــەربێ ئیمانــە غَرَضْ**
**دائیم ڤــە منڕا کینی‌یــە ، وان ضـــەرب‌و لێکدانە غَرَضْ**
**ئەڤ صَفْحَة کافوری‌یــە ، خال‌و نیشـــان لێ بونە خەط**
**هن سوهرو هن زەردن بنەفش ، دائیم ژمــە جانە غَرَضْ**
**چەهڤێن مُکَحَّلْ سورمە ڕەنگ،هەر زلف ژوان ڕشکی دبن**
**هەردەم برەمزو عیشوەیان وان قەصـــــدێ تالانە غَرَضْ**
**یەك یەك بچن ، جرف تێنە مە ، نازو کرشمان ئەو دکــەن**
**مەحبوسێ زولفــا ڕەش‌کرین ، پاشـــایی زیندانە غَرَضْ**
**ئەو ڤشــت‌و ساچێن فلفلین ، مەطلەب طەوافا نەترەکــان**
**شـــەوقێ لدل زێدەدکەن ، زولفان خو جەولانە غَرَضْ**
**زولفێن بُخمْ خُمْ عەنبەرین ، گەهـ گەهـ وەکی داڤا دبن**
**لەو نــەتــرەك وتیتی ڤەدان ، گــرتن وبــەردانــە غَرَضْ**
**[ کاتب ](١) ڤەلەم ڕەوشەن بتن ، عەتابی لێڤان وەر ببین**
**تــاســـوزو ســــازندەبن لەوڕا کــو ســـەیران غَرَضْ**

( ٢ )

## هۆزانا رەمەزان بۆتی

**ڕەمـزەك ژ هاتـــەدەر ، وێ جـــــەزبێ ئیمانــە غَرَضْ**
**دائیم ڤەمنڕا کینی‌یــە ، هــەر ضــەرب‌و لێکدانە غَرَضْ**
**زولڤێن ژ ڕەنگ داڤێن هەلەك ، شەهپر لسەر چەنگێ هوما**
**ئێــکی دلێ بــەنــدە تێ ، یــادی تــرە ژجــانــە غَرَضْ**
**دل‌گــرت بــداڤــا عــەنبــەرین ، بەرداو دیســا گرتــەڤە**
**میران ژخــوە هــەر دائیمەن ، گرتــن وبــەردانــە غَرَضْ**
**من گو گەلو دلبــە ڕەقیب ، فایــدە ژ فیتنان ڤەت هەیە**
**سوند خار بُحوسنا خوە کوتە ، لێ فِعلێ شەیتانە غَرَضْ**
**خــالێن مُدوەرْ فلفلین ، ماددە ژ مســـــك‌و عەنبــەرە**
**لەو زولف بسەردا تێنە خار ، وان سترو نشیانە غَرَضْ**
**بەژنا ژڕەنگ سەلوا سەهین ، لــەو ڕۆژ بڕۆژ عــالی دبت**
**بالا ڤِسـَەر سەروان دکەفت ، وێ سەیری ئاسمانە غَرَضْ**
**مصرێ ژ کــالانی نَشـــــاند ، جــەللادێ جلدارێ دەمیم**
**ئــەر تو نزانی ڤــەنج بزان ، وان [ إبْن دەورانە ] غَرَضْ**

---

(١) کاتبێ کارێ هۆزانڤانی بویە ، دیــسان ئەڤ ناسناڤە بخو بکارئینایە ژی . ع . م

(٢) هێژا ئەنوەر مائی ئەڤ مالکە لســــەر فەروزا هۆزانــا ناڤبری نڤێــسی‌یە :

**هەمیا ڤیــانــا زیــن دڤێ ، لێ زین نزانم کی دڤێ ؟!**
**هن چەپ دچن ڕاست دچن ، هندا ژی دیللانە غَرَضْ**

# ئەستێرەی بەختی ماموستا

نووسینی عزیز نسین
عبد الله بابکر حمەئاغا لەتورکیەوە کردویە بەکوردی

نووسەری بەوبانگ لە تەمەنی شەستو پێنج سالیدا بو ، بەلام زوربەی جار پیاوانی بەناوبانگ لای خەلکی وا دەناسرێن کەمەنیان لەوە زیاترە کە خۆیان تێیدان ، لەبەر ئەوە خوێنەرانیش وایان دەزانی کە ئەو نووسەرە تەمەنی زۆر زیاترە ، ئیتر وایان لێك دەدایەوە کە لەمەو دوا بەخۆرایی دەژیو ئەو ژیانەی کە بە سەری دەبا زیادەیە . بەناوبانگ بون لە تەمەنی کەنجێتیدا بو بە هۆی ئەوەی کە ئێستا بە پیر بناسرێ نووسەرە بەناوبانگەکان ، تەنیا لە تەمەنی راستی خۆیان زیاتر بە تەمەن دەناسرێن ، بەلکو وا دەزانرێ کە دەولەمەندیشن ، ناو بانگێکی ئەوتۆ ، هیچ بێ پارە دەبێ ، خوا دەزانێ چ مالێکی خۆشو چ شتومەکی بە نرخی هەیە ، لەوانەیە مالەکەی پربێ لە شتی جوانو عەنتیکە . ئەو نووسەرەی کە باسی دەکەین ، خەلك ناهەقی نیە کە لە تەمەنی راستی خۆی زیاتر بە،تەمەنی بزانن ، چونکە هەروەکو ئەوانەی کە بە باشیو خیرایی دەژین ، لە زووەوە پەکی کەوتبو ، ماندو بوبو ، وە ناهەقیشیان نەبو کە وایان دەزانی دەولەمەندە ، دۆلابەکەی پر لە جل نەبو ، بەلام پێنج قات چاکەتو پانتۆلێ کە دەسالێ لەوە پێش بەدووریبی دابوون ، هەتا ئێستاش هەر وەك چۆن پاش دووین کران بەتیعلاگەداهەر مابوونەوە وە ئەو جلو بەرگەی لەبەر دەکرد کەلێ‌ی دەوەشایەوە ، جا لەبەر ئەوە وا دەردەکەوت کە پیاوێکی دەولەمەندە . ئەگەر — دە لیرە لە باخەلیدا هەبوایەوای هەلسو کەوت دەکرد هەر وەکودەهەزار لیرەی تریشی پاشەکەوت هەبێ . دە لیرەکەی بە دلێ ئاوەدانیەوە خەرج دەکردوئیتر ئەوە بەس بوو بۆ ئەوەی کە بە دەولەمەند بناسرێ ، لەکاتێکدا کە لە مێژ بو وەزعو ئیدارەشی تەواو نەبو ، بەلام نەیدەهێشت کەس پێ‌ی بزانی ، ئیتر کەوتبوە رۆژگارێکەوە ناوبانگیەکەشی پارەی نەدەکـــــرد ، جا نازانم مۆدەکەی تێپەری بو ، جی بو هیچ رۆژنامەیەکو گۆڤارێك وتارو نوسینیان لێی وەر نەدەگرت ، بلاوکەرەکانیشی لەمێژ بو رۆمانیان لێ‌داوانەکرد . ئەو پیاوەشی چەند سالە بە درێژایی ژیانی بێجگە لە نووسەری کاری تری نەکردوە ، دوای ئەو تەمەنە چۆن دەتوانی کارێکی تر بکات ؟

وای دەزانی هەتاکو دەمرێ ئەستێرەی بەختی هەر دەگەشێتەوە ، باشە بەراستی ئەسێترەی بەختی کوژابۆوە ، هەتاکو ئەمرۆش هەر ناوی هەیەو خەلك ناوی دەزانێ . کاتێ کە لە شوێنێکەوە یان لەناو قەلەبالغیەکەوەتێ‌بپەرێ یان لەناوپاسێکدا یان پابۆ رێکدا ، ئەوانەی کەلەوێن ،لە نێوان خۆیاندا چرپەیان دەکردو ناوی ئەویان دەهێنا .

ماوەیەکی زۆر لەرۆژنامە کاری کردبو بەلام لە بەرێوەبەرایەتی رۆژنامەکان لەبەرەی ئەو کەس نەمابو . ئەگەر برادەرانی کۆنی لە رۆژنامە هەبوایە ئەو کاتە دەیتوانی بچێت داوای کارێکیان لێ بکات ، بەلام ئەوان نووسەری بەناونگیان دەناسی ، لەر ئەوە لە هەشوێنێك بیاندیبایە بەرێزێکی زۆرەوە سەلاویان لێ دەکردو پێیان ، دەوت «مامۆستام» .

ئیتر هەر چۆنێك بێ وای بەباش زانی کە سەرێك لە رۆژنامەکان بداو خۆیانی پیشان بدات ، بەشتێکی راستی نەدەزانی کە لە دەوروبەری هەوالگەری خۆی دوور بخاتەوە ،

ئەگەر لەم ناوە دەر بکەوێ جاربەجار خوێ پیشان بدا . بەڵکو بیریان دەکەوێتەوەو وتارێك . نووسینێك . وەرگێڕانێك شتێکی ئەوتۆی لێ داوا دەکەن .

ئەو بەیانیە لە هەموو کاتێك زیاتر خۆی ڕێکو پێك کردو جلی جوانی لە بەر کرد . یەکەمجار چو بۆ ڕۆژنامەیەك کە کاتی خۆی زۆر پەیوەندی لەگەڵ هەبوو چەند ڕۆمانێکیشی دابو بە وێ بۆ ئەوەی بە زنجیرە بۆی بڵاو بکرێتەوە . جاران کە دەچو بۆ ئەو ڕۆژنامەیە زۆر بە سەربەستیەوەو بە قۆڵ ڕاوەشاندنێکەوە خۆی بە ژوورێدا دەکرد . بەڵام ئەمجارە دەرگاوان لێی پرسی :

کێت دەوێ ؟

جا بڵێ کێی دەوێ ؟ پێویستە داوای کێ بکات ؟ کەمێك بیری کردەوەو دوای بە دەرگاوانی وت کە دەیەوێ سەرنووسەر ببینێ .

دەرگاوان وتی :

پێی بڵێم کێ داوات دەکات ؟

ئەویش ناوی خۆی پێ . وت . تەنانەت دەرگاوانێش ناوبانگی ئەوی بیستبو ، زۆر بەرێز گرتنەوە هەڵسایە سەرەپێو وتی :

– بەسەرچاو گەورەم .

تەلەفۆنی بۆ سەرنووسەر کردو دوایی وتی :

– فەرموون قوربان . چاوەڕوانتان دەکات ..

چو بۆ ژووری سەرنووسەر . لەگەڵ ئەویش ناسیاوی هەبو بەڵام ناسیاوییەکی ئەوتۆ نەبو .

سەرنووسەر هەڵسایە سەرپێ . زۆر بە ڕێزەوە بە پیریەوە هات بۆلای دەرگاکەو تەوقەی لەگەڵ کرد . جێگای دانیشتنی پیشاندا ، لێی پرسی کە جەنابی چ دەفەرموون . چ ئارەزوو دەکەن بۆ خواردنەوە .

تکایە قاوەیەك کەم شەکر بێ ...

باشە ئەگەر ئێستا سەر نوسەر لێیپرسێ «قوربان هۆی سەردانت چی بو ؟» نا ، ئەوەندە پیاوێکی قەبە نیە پرسیاری وا بکات ، ئەوەندە بەرێز پێشاندانەوە دەجوڵیەوە ، ئەگەر زۆر زۆر پرسیار بکا دەڵێ «قوربان چ ئەمرێکتان هەبو ، ئەو کاتە دەبوایە چ وەڵام بداتەوە . کە بڵێ هاتوم بۆ ئەوەیلای ئێوە کار بکەم . ئەویش نابێ ..

بۆ ئەوەی کە پێشە بری پرسیارێکی وا بکات وتی :

– بە ڕاستی نووسینەکانی تۆ زۆر سەرنجم ڕادەکێشێ زۆر پەسەندیان دەکەم .

– ئەوە لە لوتفی جەنابتەوەیە مامۆستام ...

– هەمووڕۆژێ سەر نووسینەکانت بەزەوقەوە دەخوێنمەوە .

– زۆر سوپاست دەکەم . خوا لە گەورەییتان کەم نەکات ...

– منیش لێرەوە تێدەپەڕیم . وتم با سەرێکی ئەوانیش بدەم .

– لوتفت هەیە مامۆستام ..

خۆ وەختت لێ ناگرم ...

ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام . خێرو بەرەکەتت هێنا ..

قاوەکان خورایەوە . قسەکردنە ئاساییەکانیش تەواو بون .

ئێ باشە ئێستا چۆن دەبێ ؟ خۆ سەر نوسەر هەرچۆنێك بێ تێدەگا کە بۆچی هاتوە . کابرایەکی واکە چەند ساڵە بۆ ڕۆژنامە هیچ نەهاتوە . ئێستا هەر لە خۆیەوە چۆن هاتوە ... تێدەگات . مامۆستاش چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کەسەرنووسەر بڵێ «قوربان ئێستا ڕۆمانی ئامادە کراوتان هەیە ؟ ئەگەر تکا بکەین نایدەی بە ڕۆژنامەکەی ئێمە ....» ئەویش وەڵامی بداتەوەو وبڵێ «ئێستا ڕۆمانی ئامادە کراوم بە دەستەوە نیە . بەڵام دوو ڕۆمان هەیە کە بەردەوامم لە نوسینیان . یەکێکیان خەریکە تەواوی بێ ....»

بەڵام قسەکانیان هیچ بەلایەکی وادا نە ڕۆیشت . سەرنووسەریش ویستی کە مەوزوعێك بکاتەوەو وتی :

– جەنابتان لە سیاسەت شارەزاییتان هەیەو دەزانن . لە بارەی دوا وتاری سەرەك وەزیران بیرو ڕاتان چیە ؟

قسەکانی سەرنووسەری باش گوێ لێ نەگرتبو یان تێ نەگەیشتبو . لە مێز بودانیشتبوو قسەیان دەکرد . بەڵام سەرنووسەر ڕۆمانێك . نووسینێك . وتارێك . شتێکی ئەوتۆی لێ داوا نەکرد بو .

– ئێه . بە یارمەتیتان بامینش بڕۆم . ببورن بوە هۆی سەرقاڵیتان تکا دەکەم مامۆستام . بەختیارت کردین . دووبارەفەرموون چاوەڕوانتاندەکەم مامۆستا ...

کاتێ لە پلیکانەکان دەهاتە خوارەوە بیری ئەوەی دەکردەوەکە سەرنووسەر پێی وتبو «دووبارە فەرموون . چاوەڕوانتان دەکەم مامۆستام» ئەوە مانای چیبو ؟ ئەوە دیاربو کە بۆ جارێکی تر بانگی دەکردەوە . خۆ هەرچۆنێك بێ لە یەکەم سەرداندا نووسینێك یان بەرهەمێکی ئەدەبی لێداوا ناکات . هەربێ ڕێزیش دەبوبەڵام لەهاتنی دوومیدا دیاربو کە نووسینێك شتێکی هەر لێداوا دەکرد . بەڵکو سەرنووسەر مافی ◁

داواکردنی نووسینێك یان بەرهەمێکی ئەدەبی نەبێ ، دوایی سەریدا لە رۆژنامەیەکی تر ، ئەمجار دەیویست کەخاوەنی رۆژنامەکە ببینێ ، باوکی ئەوی باش دەناسی ، لەگەڵ خوا لێخۆشبو برادەرایەتیو تێکەڵاویەکی باشی هەبو ، جا بەهۆی ئەوەوە باسی یادی خوالێ خۆشبو دێتە گۆڕێ ئیترزەحمەتی بێ مەوزوعیش ناکێشن .
دەتەوێ کێ ببینی!؟

— دەیوست خاوەنی رۆژنامەکە ببینێ ، بەڵام ئەو لە ئەوروپابو ، کاتێ کە چوە دەرەوە لای دەرگاکە ماوەیەك دوو دڵ بو ، ئایا بگەڕێتەوە یان بڕوا ، دوایی گەڕایەوەو وتی :

— کەوابو با بەڕێوەبەری کارو باری نووسین بینم .

— بڵێم کێ داوات دەکات ؟

ئەویش ناوی خۆی پێوت .

ئەو قسانەی کەلەگەڵ بەڕێوەبەری کاروباری نووسیی ئەم رۆژنامەیەی کرد ، هەر وەکو ئەو قسانەی بو کە جاری پێشو لە گەڵ سەرنوسەری رۆژ نامەکەی تری‌کرد ، لەو لێدوانە تەنیا شتێکی لێ زیادبوو ، ئەو ئەویش ئەوەبو کە بەڕێوەبەری کاروباری نووسینی وت کەوا کاتی خۆی لەرۆژنامەو تارو نووسینی نووسیوە ، لەبەر ئەوەش وای وت . بۆ ئەوەی بەڵکو بەڕێوەبەر بۆرۆژنامەکەی وتارێك یان بەرهەمێکی ئەدەبی تری لێ داوابکات .

— بەڵکو تۆ ئەو رۆژانەت وەبیرنایە ...

— ئەوە دەڵێی چی ماموستا ، چۆن وەبیرم نایە ! هەمو رۆژێ وتارەکانی تۆم دەخوێندەوە ، تەنانەت تاکوئێستا بەشی زۆری نووسینەکانی تۆم لەبیر نەچۆتەوەو لای خۆم هەڵم گرتون .

— ئەوانەی ئێستا ئەوەندە ... یان نازانم چۆن بیڵێم ... زانینی نرخی‌وتار نوسین شتێکی ترە ... بەڕاستی وتار نووسین شتێکی بە زەحمەتە ...

— ئاە ماموستام ، نووسەرانی زەمانی ئێوە ئێستا لەکوێن ، کوا ماون

دەیویست بڵێ «هەیتو کوێرێ ، ئەوەتا لە بەرامبەرت دانیشتوە !» بەڵام خۆ شتی‌وا ناوترێ ... کاتی جیابونەوە ، بەڕێوەبەری‌کاروباری نووسین وتی :

— ماموستا ، تکات لێدەکەم دووبارە تەشریف بفەرمون چاوەڕوانتان دەکەم ...

ئیتر بەم جۆرە ماوەی هەفتەیەك ، رۆژنامەو گۆڤارەکان گەڕا ، خاوەنو سەرنوسەرو نوسەرو سکرتێری ئەو رۆژنامەو گۆڤارانەی دی‌و قسەی لەگەڵ کردن ، لەگەڵ ئەوانە لەبابەت وتار نوسینو رۆمان ریپۆرتاجو وەرگێڕانو ئەم جۆرە شتانەقسەو گفتوگۆی دەکرد ، بۆ هەر شوێنێك کەدەچو بەم جۆرە بەڕێیان دەکرد «دووبارە فەرمون ماموستام چاوە ڕوانتان دەکەین» ماموستاش لەو شوێنانەی کە چاوەڕوانی دەکرا ، دووەم جار ، سێیەم جار سەری دایەوە ، بەڵام کەس نەبو کارێکی بداتێ وەیان بەرهەمێکی ئەدەبی لێداوا بکات .

لەبەر ئەوەی کە زۆر رێزیان پێشان دەدا بە ڵکوشەومیان لێ دەکرد ، یان وایان دەزانی کەنوسەری بەناوبانگ وەزعی باشەو پێویستی بەکار کردن نیە ، ئەویش بڕیاری‌دا کەبەراستی‌و بە ئاشکرای کارێك داوا بکات ، لە بەرئەوەی کەبەگەنجێتی لە رۆژنامەکاری کردوە ، دەیزانی کەبۆ سەر نوسەری ، نوسەری ، بەڕێوەبەرایەتی یان کاری تەکنیکی زۆر گرنگ رقە بەرایەتی هەیە ، جا لەبەر ئەوە دەیزانی کە لەم جۆرە کارانە نادرێ بەو ، ئەویش چاوی لەم جۆرە کارانە نەبو ، ئیتر کارێکی وا هەبوایە خۆی پێ بەڕێوە بردبایە بۆ ئەو بەس بو ، دووبارە دەستی کردبە گەڕان بەناو رۆژنامەو گۆڤارەکاندا ، کە دەچو بۆهەر جێکایەك بەماموستام ، ماموستام بەخێرهاتنیان دەکردو ئەوەندە رێزیان پێشان دەدا ، ئیتر لەبەر ئەوە نەیدەتوانی دەری‌بخا کەوەزعو ئیدارەی باش نیە ، بەڵام دەیتوانی شتی تر بڵێ : لە بەر ئەوە ی

بێ‌کارەو لە ماڵەوە دادە نیشێو دڵی دەگوشرێ ... ئێ ، زۆریش پیرنیە کە نەتوانێ هیچ کارێك بکات ... ئێستاش هەر لە تەمەنی کار کردندایە ... لەبەر بێ‌کاری زۆر وەرز دەبێ ...جا ئەگەر کارێکی بچوك‌هەبوایە خۆی پێوە خەریك بکردایە ... سەر نوسەر یەکسەر وتی :

– ئا مامۆستام ، ئەوە دەڵێ‌ی چی ... خوا نەخواستە ، خوا بەو رۆژە نەکات ... بە ڕاستی هەر شەرمیش دەکەم باسی بکەم ، چونکە لەو رۆژ نامانەدا هەرکارێکی واشن نیە کە شایەنی جەنابت بێ ... ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام جا هیچ کاری بچوك بۆ جەنابت دەبێ ؟ تەنانەت کاری گەورەش بۆ جەنابتی بەلایەق نازانم ... کاتێ کە مامۆستا رۆیشت ، سەرنوسەر هەروەکو جاری پێشویی‌ی وت :

– دووبارە فەرمون مامۆستام ، چاوەڕوانتان دەکەم ، چوبۆ رۆژنامەیەکی تر ، بەڵام ئەمجار وەکو جاری پێشوی نەکرد کە بڵێ لە ماڵەوە لەبەر بێ‌کاری وەرز دەبمو دڵم دەگوشرێ ، بۆ ئەوەی کەوەرزیم بشکێ دەمەوێ خۆم بە کارێکی بچوکەوە خەریك بکەمو ئیتر لەم جۆرە قسانە ، هەربە ئاشکرای دەری بری کە وەزعو ئیدارەی باش نیە بەڵکو شتێکی‌وا بکەن کە کارێکی بچوك وەکو ڕاستکەرەوەی بدەنێ .. خاوەنی رۆژنامەکە وتی :

– جەنابی مامۆستام شتی واچۆن دەبێ ، ئەستەغفیرەڵڵا ، هیچ ڕاستکە رەوەیی بۆ جەنابت دەبێ ، ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام ، رێکی ئەوتۆ بۆ یەکێکی وە وەکو جەنابت هەر بەلایەقیش نازانم .

مامۆستاش بە ئومێدەوە وتی .

ئەگەر ڕاستکە رەوەیی نەبێ واتە کارێکی تردەبێ .

– ئای مامۆستام ، حەدمان چیە ، بەڕاستی زۆ شەرمە زارت کردین ... چو بۆ رۆژنامەیەکی تر ، لەوێ بە ئاشکرا تر قسەی کرد ، سێ مانگە ناتوانێ کرێ‌ی خانوکەی بدا ، کەوتۆتە ژێر قەرزو قوڵەوە ، جا ئەگەر کارێك هەبوایە بەگوێرەی ئەو ، هەرچی بێ قەیناکا هەر دە یکات ، ناچار بو کە بیکا ، ساڵەهای سالبو کەلە هەمو جۆرەکارێکی رۆژنامەکاری کردبو . ئیمکانی نیە ! .. شتی وا هەرنابێ ! ... بەخوا مامۆستا وادیارە گاڵتەمان پێ دەکەی .. ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام مانای چی ؟ شتی وا چۆن دەبی ؟... یەکێکی وەکو جەنابت ... دوایی چو بۆ رۆژناحەیەکی تر ، واپێویست بو کە لەوێ بە ئاشکراتر قسە بکات ، ئیتر هەر چی لە دڵی دابو وتی‌و ڕاستیەکەی دەربری ، وەزعی زۆ ناتەواوبو ، تەنانەت جلە کۆنەکانیشی فرۆشتوە ، تەنیا ئەو جلو بەرگەی مابو کە لە بەریابو ، ئیتر بێجگە لەوەچی تر بڵێ ؟ ئەگەر ڕاستکەرەوەی هەبێ یان هەرکارێکی تر هەبێ تەنانەت بەکاری شەویش هەر قایلە ..

– ئەستەغفیرەڵڵا ، مامۆستام .. چۆن شتی وا دەبێ بۆجەنابت ؟... بۆ نووسەرێکی گەورەو بەناوبانگی وەکو جەنابت ... خوا نەخواستە مامۆستام ... ئەمە بۆ جەنابت هەر سوکایەتیش دەبێ ، خوا بەو رۆژە نەکان مامۆستام ... کاتی خۆی بەبیستنی «ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام» زۆر هەستی بە شانازی دەکرد ، بەڵام دوایی تێکەیشت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵی بەوە خۆش دەبو کەپێیان دەوت «ئەستەغفیرەڵڵا مامۆستام» هەرچەندە کە هیچ کارێکیان نەدەدایە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جار سەری لە رۆژنامەو گۆڤارەکان دەدا ، تەنیا بۆ ئەوەی گوێی لەوقسەیە بێ‌و کەمێك دڵی خۆی پێ خۆش بکات بە ئەستە غفیرەڵڵا مامۆستام»

• هەمو دڵخۆشدرانەوەیەکی ئەوە بو کە گوێی لەو قسەیەبێ .

# شەوی .. هەزارو .. دووەم

مرۆ بۆ خوابلیٚ .. شـــاهیدی لە ئیمانە ، حاجی شـــــیٚخ مەلا عبدالقدوسی قازیی شـــــاری « جابولقا » کـە دوا چەکـــەرەی ، بنەماڵەی شیٚخ قوتبەلدینی ، خاوەنی دینو دونیای سەردەمی خۆی بـو ، پیاویکی ڕاســـــتگۆ .. و .. راستڕۆ ، بو .. زۆر جار لەگـەڵ خۆیدا دەیکوت :

**— بۆچی .. خـۆم بگـۆرم ؟! تاکەی .. راســــتیی لەم خەلکە بشارمەوە ؟! ســـەبارەت بەچی .. خۆم شەرمەزاری دونیاو قیـامـەت بکەم ؟؟ ..**

ئەوەبو ، بریـاریدا .. خـــوای خۆی پتـر رازی بـکا .. وجـــدانی بەهەســـــینیتەوە !! باری ئازاری قەبریش لەسەر بابو باپیرانی سووك بکاو ... نەهیٚنیەکە ، ئاشـکرا .. بکا !!؟

لەنیوە شــــەویٚك ، پاش ئەوەی ســــــونەتو تەراویحەکەی بەجیٚ گەیاند ، لەسەر بەرماڵ هەلســـتا ، بە پەنجەکانی دەســـــتی .. ردیٚنـە سپیە دریٚژەکەی شانەکرد ، حەمدو ســـــەنای خـوای کرد ، لیچکی بەرماڵەکەی هەلدانەوە ، رای‌کــردە لای دیوارەکە ، دەستی بۆ دەلاقەکـە دریٚژکرد ،کتیبەکونەکانی ئەم دیوو.. ئـەودیو کــردن ، هــەلی دانـەوەو دایـنـانـەوە ، تـا .. پیچراوەیکی زەردی .. پیــری .. لــەنـاو دەرهیٚنـان !! .. تۆزو خولەکـــەی لیٚداوەشاند .. خستیە بن هەنگلی ، گەرایەوە جیگاکەی . ســـینگو بەرچیٚرو لاشـــانەکانی خۆی .. و دامەنی چوبیەکەشی داکوتـــان ، بیٚ ئەوەی لیچکی بەرماڵە لیك بکاتەوە ، لە سەری دانیشتەوە !! چاویلکەکەی کردە چاوی ، بەئاسپایی پیچراوەکەی لیٚـك‌کردەوە ، ئاوریٚکی لــە دەروو دیواری حوجرەکەی دایەوە ، بەدەنگ دەستی بە خویٚندنەوەی کرد :

**— لە شەوی هەزاروو دوەمدا ، شەهرەزاد لەسەر تەختە بەندەکەی ، راکشـــابو .. جارجار نرکـــەیکی دەکرد ، بەدەنگیکی ناســـــك دەی نالاند !! ژوورەکەی لەناو کۆشـــکە گـــەورەکـــەدا ، وەك رۆژ دەدرەو شایەوە ، ئەو شەوە شەوی پیٚنانـە دونیای ، بەری شــــیرینی ئەویٚنیو دلســــــۆزیو یەکبونی بو لـەگـەڵ شەهرەیاردا . بەری هـەزارو یـەك شەوی ، پڕ ئامەرانی .. دلنیایی .. بـرواو ئـاواتو هیــوا ... بـو ، شەهرەیاریش لەســــەرینگانی ژنـە خۆشەویستەکەی دانیشتبو ، بەری دەستیکی لەســــەر هەنیەگەرمەکەی راگرتبو ، ناو ناوەش ، دەستەکەی دەگویزایەوە سەر رووومەتە ســوروو تەرمەکانی ... بە بزەییکی گـەش ، دەیدواند ، رازو نیازی لەگەڵدا .. دەگۆرینەوە .**

لەنـاو ئـەم رازو نیازە ، لەپـر ، سـەردەستەی جاریەکانی کۆشـــك ، دەرگای کردەوە ، چرپەییکی بەگویٚی شـەهریاردا کرد ، شــــەهرەیار ، دەستەکەی ســـــــەر رووومەتی شەهرەزادی کیشایەوە ، هەلستایە سـەرپیٚ ، ژوورەکەی بەجیٚ‌هیشت !!

شـەهرەیار ، زۆر دلی ، بەکۆرپـە چاوەنوارکراوەکەی خۆش‌بو ، کـاتیٚ خەیالی .. لـــە رۆژە رابوردوەکانی پیش ناســـــینی شــــــەهرەزاد ، دەکردەوە ... شەرمیٚك دەیگرت ، ئـازاریٚـکی دژوار دەکـــــەوتـــە دەروونیەوە !! .. پەشیمانی لەســـەر رووی دیاری دەدا !! بۆ داپۆشـینو رەش کردەوەی شـــوین ئـەو رۆژە رابوردوانە ، و .. بە بۆنەی ئەم‌رۆژە پیرۆزە شــــــۆوە ، دەنگی دابو ، هەرچ .. حەکیمو شـــــالیار .. پزیشك .. زانا ، . و داناو شـیٚخو کــــەشیشو پیاوماقوولو لیٚزانـانی چوارقورنەی ولاتی ، بانگهیشـــــتن کردبون ، کۆی کربونەوە .. تـا .. لە ئاهەنگی لەدایك بوونی جیٚگرەکەی، هــەریــەکـە بەپیٚی توانـاو زانایی‌و لیٚوەشانەوەو شارەزاییان ، بەهــــرە بنوێنن ، بـۆ ئـەوەی منـداڵــەکەی بـەریٚـك‌وپیٚـکی ، بیٚ‌گـریو کـەمو کورتی ، لە دایك ببیٚتەوە . لە هۆلە فراوانەکەی کۆشك ، لەبەردەرگـای ژوورەکەی شـــــــەهرەزاد .... هەزاران لەو .. زاناو داناو حەکیمو پزیشكو فەیلەسووفو نووســــەرو رۆژنامـەچی .. پیاو مـاقـوولان ، ریزیان بەستبو ، چاوەنواری لەدایك کــەوتنەوەی ، شــــایەچچەیـان دەکرد !! زاناکان ، کتیبەکانیـــــان کردبونەوە ، داناکان سەریان بەسەر، ریشــــیان داگرتبو .. و لەگــــەڵ فەیلەسووفەکان ، سیٚو دوویان ، بە پەنجـە رەقو تیژو دریٚـژەکانیـــــان دەکرد !! لە ناو دەریای عیلمو فیکر، ووشکە مەلەیان دەکـرد !! حەکیمو پزیشکەکان ، چەقۆو نەشتەرەکانیان دەســـوین ، دەرزیو دریشــــــەو ســوژنەکانیان .. تیژدەکردنەوە .. خەلیفەو دەرویشـەکان ، شـــــیرو زەرگو رمەکانیان ، ئاومال‌کردبوون،

بریقـەیـان لێ هەڵدەسـتا !! ئەستێرەوانەکان ، گوێ ماسـیو چۆرتیان هەڵداویشتن ، نووسـەرو رۆژنامەچیەکان .. تـەواو قورمیش کرابوون ، چاوو گوێچکەیان کردبوون بە رادار !! لـە ریزەکانی دیکەش ، میر .. و والی .. ئاغاو قومەندانو بازرگـانـەکـان ، فـەرمـانـبـەر قۆنتەراتچیەکان ، دەمیان .. بزەی خـۆشی لێدەباری ، بـەڵام کـەس نەیدەزانی ، دڵو دەروونیان چی .. تێدایە !؟ .. لەدوای ئەمانە شـەدە ، ریزی گوڵبەدەستان .. ریزی دیاری هـەڵـگران ، شـاعیر .. و .. بخـورپژێن .. لـە هۆڵەکەدا جیگای خویان گرتبوو !! .. لـە دەرەوەی کۆشکیش ، دەرگەوانەکان ، لەبـەر تاقـە گەورەکە ، خۆیان چاندبو !! چەک بـەدەسـتان ، بەدەورەی کوشکدا دەسـورانەوە ، تا .. ناحەز .. دوژمن ، شەوە دێوودرنج هەموو ئەوانەی لییان دەوەشـێتەوە زیان بەکۆرپە سـاواکە بگەیەنن ، لەنـاویـان بەرنو تەفرو توونـایـان بکەن !! .

لەدوای ئەمانیشـەوە ، لۆتی .. مـەیموونـەوان .. دۆڵـەنگێـو ، تەنافبـاز ، بۆری ژەن ، چـاوەشو سـەماکەران ، هەر رێزەی بەپێی بەهرەیان .. دەوری خویان دەگیرا . لەپاشی پاشەوەش جەماوەری خەڵکی وڵات ، لەگۆرەپانەکەی بەرتـاقـە گەورەکە ، لە مەیدانەکانی شـار ، ئاهەنگیان سازدەدا ، بەزمیـان دەگیرا ، دوعـای سـاغیو سەلامەتیی .. شازادەی تازەو .. شەهرەزادی دایکیان دەکرد .

شـەهرەیاریش ، لـە هەیوانە فراوانەکەدا ، لـەنـاو ریزەکـان ، دەهاتو دەچوو ... زاناو گـەورە پیاوەکانی دەدواندن ، رووی خۆشـی تێدەکردن ، بزەی شادیی بەسەردا بڵاودەکردنـەوە . نـاوناوەش ، بـۆ سـەر بالکونەکە سـەردەکەوت ، سـەریکی لـە حەشاماتەکەی ، بـەر تاقی کۆشک هەڵدەکێشا ، بەرووبانەوە دەگەشایەوە ، بەدەست تەمەنـای بۆ دەکردن .

کاتێـك کە دەنگی :ـ ئەنغـا ... ئەنغای .. سـاوایەکە لە ژووری شەهرەزاد ، بەرز بووەوە ... دەرگای ژوورەکـە کـرایـەوە ، پیرێـژنـە سەرسپیە پسپۆرەکە ، بە پـەلـە ، دەرپەرپە دەرەوە .. بۆ شـەهرەیار نووشتایەوە ، شەهرەیار لەتوشیاندا راپەری ، رووی کردە هۆڵـەکـە .. بانگی موژدەی راهێشت :

— **موژدەبێ ... کـورێکمان بـوو ... خـۆشی لـە ئیـوەش ، شازادە یەکتان بو !! ..**

لەگەڵ ئەو بانگە ، هۆلە فراوانەکە، وەکو دەریا ، شـەقا .. ریزەکان ، مۆنج .. مۆنج ، کـەوتنە ململانێو پالدان !! هەریەکەیان دەیەویـست پیش ئەویتر بگاتە خزمەت شا ..و .. شاژن ، پیرۆزبایيان لێبکاو .. بەدیدەنی مـەلـۆتکە پیرۆزەکـە .. شادبێ !! .. لە ئەنجامی ئەو هێنانو بردنە ، و بەیەکدا هاتنەی ریزەکان ، گـەلیـك ریشسپیو بێهێـز ، دەکەوتنە ژێر پێیانو .. هاواریـان لێهەڵدەستا !! حەکیمو پسـپۆرو پزیشکەکان ، چەقۆ .. و نشـتەرو دەرنافیسو ئامـرازە ووردەکانیـان لەمەلۆتکە ساواکە خستەکار !!

فەیلەسووفو داناو .. زاناکان ، چنگیان لەلاشە ناسکەکە ، گیرکرد !! شالیارو بازرگانو ئەوانی دیکە ، کە خۆیـان لـەدواوە دەدیت ، دەم .. نادەم .. لەسەرخۆ .. بە پاشـەدزە . بۆی دەکشـانەدواوە .. تـا .. بەگوڕ ، خویان لەریزەکانی پێشـەوە دەدا ، بریان پێ دەدان .. بە تەکان ، کە لێنیان تێ دەخستن .. خۆیـان لـە کەلێنەکانەوە دەبـرد .. تـا دەگەیشـتنەسەر مەلۆتکەکـە !! مەلۆتکەکەیـان لـە بـاوەش دایـکی هەڵدەگرت ، هەریەکەیان دەستکاری خۆی تیدادەکرد !! ئەمانە ناحەقیـان نەبو هەریەکەیان حەزی لە خزمەتێك بو پیش‌کەش .. بە جێگری شاهیان بکەن .. و دلسوزی خویان ئیسبات بکەن !! .. ئەو دلسۆزانە ..بەیەکیك لووتی ساواکەی دەگوشی تا راستی بکاتەوە ، وەك دەنووکی کونـدە بـە بۆ .. خواری دەکرد !! ..

ناوکی سـاواکەیان لە رەگەوە دەرکێشـا !! ئەوەی فرچکیدەدا ، وەهای رادەوەشاند ، دەستو پێی سـادا ناسکەکەی لە .. کە ..

دەبـردن !! یـەکیـك گـویچـکەی دەخـورانـد ، لـەبنـاگوێـرە هـەڵی دەقەنی !! پزیشـکەکان لا گونێکی کۆرپە سـاواکەیان لێکردەوە ، دەیـانگوت .. لـووە .. و زێـدە گۆشتە !! بـە هەموو لایێك لـە خۆشەویستیاندا ، ساواکەیان لێـك دەکیشایەوە .. تا .. شـەتو .. گیرو کـەلو کرۆمیان کرد !! .. و کردیان بـەجـۆرە دەعبایێك .. بـە هەموو شتێك بچیبە .. بەنی ئادەم نەبێ !!؟

شەهرەزادی دایك ، کـە ئەمەی بە چاوی خۆیدیت ... یەکسـەر لەهۆش خۆی چو ...

شـەهریاریش ، خوێن .. بـەری چاوی گرت ، ئاگـریـك کـەوتـە دەروونیەوە ، لەرکـانـا ، فەرمانیدا بو دوا جار ، دەرگـای زینـدانی پرمشكو ماری ژێرزەوی کۆشـکی شاهانە .. بکەنەوە !! . لەسـەر ◁

مێژوونووسەکەشی کرد ، کە ئەو شەوە ، لە دەفتەری ژیانی بنەماڵەکەی تۆمار نەکا !! وە لە هەموو مێژووی ئەو سەردەمەش بیپەڕێنی !!

بەم رەنگە هەتا ئێستاش هەموو عالەم ، هەر ، هەزاروو یەکشەوەکە دەچوونەوەو دەیچونەوە کەسێك ئاگاو خەبەری لەم شەوی شەوە زەنگەی هەزارو دوەمینە ، نیە !!؟

شێخ عبدالقدووسی ، قازی شاری ( جابولقا )ی ، نەوەی شێخ قوتبەلدینی گەورە ، کە .. لە خوێندنەوە بوەوە ، نووسراوەکەی پێچایەوە ، بەچاکی لوولیدایەوە ، لەسەر بەرماڵەکەی هەڵیهێنا ، و خستیەوە جیگاکەی لەناو دەلاقەکەدا ! .. ئەمجا هەر بەپێوە ، ئاهێکی فێنکی توندو درێژی هەڵکیشا ، رمێك خۆی لێك کێشابەوە وەکو باریکی گرانی لەسەرشانی لادابێ دا ، لەشی سووك بوو ، بە هەڵبەز .. هەڵبەز ، گەرایەوە سەر بەرماڵەکەی ، ئەو وەختەی لیچکی بەرماڵەکەی لێك دەکردنەوە ، بۆ یەکەم جار وەنەوزیکی .. درێژ .. درێژی ... دایەوە ، ماوەییەك هەستی راگرت .. گوێی رایەل کرد :

— **قوو ... قوو .. قو ... قو .. قو .. وو .. وو ..**

کەلەشێری بەیان .. بانگی دەدا ...

رووی لە قیبلەکرد ، فەرزی بەیانی بەجێ گەیاند ... لەسەر بەرماڵەکەی .. گرمۆلەی کرد ... تا .. خەوێکی قوول ، بردیەوە . ▷

دەریا مەزنە . لای کەنارەوە لەسەرخۆ هەناسە دەدا . لە دوورەوە خەوی لێ‌کەوتووەو جوولەی لێوە نایەت . رووناکیی تیشکی شینی مانگی تێ‌ڕژاوە . نەرم و زیوینە .

لەگەڵ ئاسمانی شینی باشووردا تێکەڵبووەو کرۆکپ نووستووە . پەڵە هەورە تەنکە ڕیشاڵ ڕیشاڵە ئۆقرە نەگرتووەکانی تێدا وێنە داوەتەوە کە ئەستێرە زێرینەکان ناکەن بە ژێرەوە . وا دێتە پێش چاو ئاسمان تا دێ پتر خۆی بە سەریا دەچەمێنێتەوە ، وەك بڵێی بی‌یەوێ بزانێ لەبەر چی‌یە شەپۆلە بێ‌ئارامەکان چرپە چرپ دەکەن‌و خەواڵوو خۆیان دەهاونە سەر کەنار .

چیای بە درەختی چروپڕ داپۆشراو بەرەو باکووری رۆژهەڵات کشاوە . لووتکەی بەرز و بڵند گەیشتوونەتە ناو چۆڵای شینی سەر سەریان . جوغزی سەخت دەوری داون . بەرگی گەرم و ئاسکی تاریکیی شەوی باشووریان پۆشیوە .

چیاکان لە دەریای خەیاڵدا نقوم بووبوون . سێبەری رەشیان لێوە دەکەوتە سەر شەپۆلی ئەستووری سەوزباو ، وەك بیانەوێ ئەو تەنیا بزووتنەوەیەش راگرن . دەنگی نەبڕاوەی نەرمە هاژەو هەناسەی کەف و هەر دەنگێك سەر لەو هێمنی‌یە نهێنی‌یە بشێوێنێ کە وا لە نێو رووناکیی زیوینی مانگ‌و لە پشت لووتکەی چیاکانەوە خۆی شاردۆتەوە ـ کپ بکەن .

ئە ـ للا ـ هو ـ ئەکبەر ! .. نادر رەحیم ئۆغلی لەسەرخۆ هەناسەیەك هەڵدەکێشێ . شوانێکی پیری کریمی‌بوو ، بالا بەرز ، موو چەرموو ، رەش هەڵگەڕاوی بەر خۆری باشوور . پیرێکی وشك‌و زرنگ .

هەردووکمان پێکەوە لەپاڵ ئەو تاشەبەردە گەورەیەدا کە لە چیای دایکی دابڕابوو و بەرگی قەوزەی کرابووە بەر ، لەپاڵ تاوێری دڵتەنگ‌و رووگرژدا ـ لەسەر لەکە راکشابووین . ئەو لایەی رووی لە دەریا بوو ، شەپۆل بە قوڕو لیتە سواغی دابوو .

دیوی ئەو دیویشی وەك دیوارێك وا بوو لەپاڵ گردێکی لمدا کرابێ بۆ جیاکردنەوەی دەریاکە لە چیاکان . گڕی ئاگرەکەی ئێمە ئەو دیوەی رووناك دەکردەوە کە رووی لە چیاکان بوو . سێبەری گڕەکان بە ناو تلیشی قوولی پیرەبەرددا هەڵدەهاتن .

من . رەحیم شۆربای ماسیمان لێ‌دەنا ، لەو ماسی‌یانەی کە هەر ئەو دەمە گرتبوومانن . هەردووکمان بیرمان بەوەوە خەریك بوو کە مرۆڤ لای وا دەبێ دەورروبەر بەتەواوی لەبارە بۆ ئەوەی بتوانێ بچێتە قوولایی دڵی خۆیەوە . کاتێ دڵ زۆر بێ‌گەرد و سافە . هیچ ئارەزوویەك لە ئارادا نابێ ، ئارەزووی بیرکردنەوە نەبێ .

دەریا لای کەنارەوە شۆخ‌و شەنگە . دەنگی شەپۆلەکان هێندە ناسکە هەر دەڵێی داوا دەکەن رێیان بدەن بێن بۆ بەر ئاگرەکە خۆیان گەرم‌کەنەوە . هەندێ جار لە نێو ئاوازی نەرمە هاژەکاندا ئاوازێکیان بەرزتر و بزێوترە . ئەمە یەکێکە لە شەپۆلەکان ، ئازایانەتر خۆی گەیاندە نزیك ئێمە .

رەحیم لە سەر سنگ لە سەر

○ هەکسیم گۆرکی ○

# گۆرانیی هەڵۆ

د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف
لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە کوردی

لەکە ڕاکشــاوە . ڕووی کردووەتــە دەریا و بــە دەم خەیاڵەوە بۆ لێلایی دوور دەڕوانێ . ئانیشکی دادابوو . دەستەکانی خستبووە پشـــــت ســــەری . کڵاوە خوری‌یەکەی بــە پشت سەریەوە گیرســـابووەوە . شــەمالی نەرم لە دەریاوە دەهات و لــە ناوچاوانی پانی پڕ وردە چرچ و لۆچی دەدا . بێ ئەوەی لێم بپرسێ ئاخۆ من گوێی بۆ شل دەکەم یـان نە ، کەوتە فەلــــــــەفەکردن . بەتەواوی لەگەڵ دەریا دەدوا :

مرۆی خواناس دەچێتە بەهەشت . ئەی ئەوەی بــە قســـــەی خوا و پێغەمبەر ناکات ؟ ئــەو ڕەنگە لــەو کەفەدا بێ ... ئەو پەڵە زیوینانەی لەسەر ئاوەکەن ، ڕەنگە ئەو بن ... کێ چوزانێ ؟

دەریای تاریکی مەزنی ڕاکشـــاو ڕوونتر دەبێتەوە . تریفەی مانگ لە هەندێ شوێنی ســــەر دەریا بەدەر دەکــــەوێ . مــانگ لــە لووتــکەی چیاکانەوە دەبەڕێتەوە . ئێســــتا خــەیــالاوی ڕوونــاکیی خــۆی دەڕژێنێتــە نــاو دەریـــاوە . وردە شــەپۆلەکان بە پیری‌یەوە دەچن .

— داوام لە پیرەکرد : ڕەحیم ! حیکایەتێکم بۆ بکە .

ڕەحیـم بێ ئەوەی ڕووم تێ‌بکا ، وتی :

— بـۆ ؟

— هەروا ! حەز لە حیکایەکانی تۆ دەکەم .

— هەموویانم بۆ گێڕاویتەوە . زیاتر نازانم .

حەزی دەکرد زۆری لێ‌بکەم ، بۆیە منیش زۆرم لێ‌کرد . ڕەحیم قایـل بوو . وتی :

— حەزدەکەی گۆرانی‌یەکت بۆ بگێڕمەوە ؟

— حەزدەکــەم گــوێ لــە گۆرانی‌یەکی کۆن بگرم بــە ئاوازێکی غەمگینەوە .

ئاوازی تایبەتیی گــۆرانی‌یەکــەی ورد ڕادەگرت و دەیگێڕایەوە .

— ١ —

« بــەرز خــۆی گەیاندە لووتکەی چیا و لەوێ لە کوندڕێکی شێ‌باویدا لێی کەوت . خۆی گرمۆڵــە کرد و دەیڕوانی‌یە دەریا .

خۆر ، بەرز ، بــە ئاســـــــمانەوە تیشکی دەدایەوە . چیاکان هــەوای تین تێکەوتوویان لــە ئاســــمانــەوە هەڵدەڤڕی لە خواریشــەوە شــەپۆل بە گابەردەکانیدا دەکێشا .

لووزەوی ئاو ، لە کونێکەوە ، بە لێشاو و پڕیشـــکەوە بەرەو ڕووی دەریا دەچوو . ناڵەی لە بەردەکـان هەڵدەستاند .

سەرتاپای لە کەفی سپیدا بوو .. سپی و بەهێــز ، چیـای دەدڕی و دەکـــەوتە دەریاوە . بـــە تووڕەیی دەینەڕاند .

لە ناکاو لەو کوندڕەوە ، کـــە وا هەڵۆ خۆی تێــدا گرمۆڵە کردبوو ، بە سنگی شــــکاوەوە ، بە پەڕی خوێناوی‌یەوە ، لە ئاســـماوە خۆی هەڵدایە خوارەوە ...

لەگەڵ قیژەیەکی کورتدا کــەوتــە سەر زەوی . بە قینێکی بێ‌هێزانەوە سنگی کوتا بە بەردێکی ڕەقدا ...

ماراوی‌یەك لــەو شوێنەدا بوو . ترسا . بە پەلە دوورکەوتەوە ، بەلام زوو تێ‌گەیشــت کە وا ژیانی مــەل تەنها دووسێ دەقیقەی ماوە .

لە مەلی تێکشاو نزیك کەوتەوە . ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووی چاوەکــانی فیشکاندی :

— چی‌یە ؟ دەمری ؟

— بەڵێ دەمرم ! هەڵۆ وەلامی ماری دایەوە .

هەناسەیەکی قوولی هەڵکێشا . ◁

من بەشانازی‌یەوە بەشی خۆم ژیاوم ! .. من لە مەعنای بەختیاری دەگەم ! .. من مەردانە جەنگاوم !.. ئاسمانم بینیوە ، تۆ لە نزیکەوە وا نابینی ! .. ئای کلۆل خۆت !

**— جا ئاسمان چی‌یە ؟ شوێنێکی بەتاڵە ... من لەوێ چۆن دەتوانم بخشێم ؟ لێرە شوێنم زۆر باشە ... گەرم و تەڕە .**

مار بەو جۆرە وەڵامی مەلی ئازادی دایەوە . لە دڵدا بەو وڕێنەیەی ئەو پێ‌دەکەنی و ...

بەم جۆرە بیری‌کردەوە : « بفڕی یان بخشێی ، سەرەنجام ئاشکرایە : هەموو لە ناو زەویدا ڕادەکشێن .. گشت دەبنە خاك ... » .

هەڵۆی نەبەرد لەپڕ ڕاچڵەکی . هێزی دایە بەر خۆی و کەمێك هەڵستایەوە . چاوێکی بە کوندڕەکەدا گێڕا .

لە هەموو لایەکی کوندڕەکەوە جۆرە چۆڕی ئاو بوو دەهاتە خوار . کوندڕی تاریك گەرم بوو . بۆگەنی لێ‌دەهات .

هەڵۆ هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە . بە خەم و ئازارەوە قیژاندی :

**— ئای ! ئەگەر بهاتایە جارێکی‌تر بەرزبوومایەتەوە بۆ ئاسمان ! دوژمنم بە سنگی برینداری‌مەوە دەنووساندو ... تا لە خوێنی منیدا دەخنکا . ئای لە بەختەوەریی نەبەرد ! ..**

مار وا بیری‌کردەوە کە « مادەم ئەو وا وڕێنە دەکا ، دەبێ لە ڕاستیدا ژیان لە ئاسمان زۆر خۆش بێ » و ...

بۆ مەلی ئازادی پێشنیار کرد : بچۆرە سەر لێواری کوندڕەکە . لەوێوە خۆت هەڵدەرە خوارەوە . بەڵکو باڵەکانت هەڵبێنەوەو دیسانەوە لەو سروشتەی خۆتدا کەمێك بژیت » .

هەڵۆ ڕاپەڕی و بە شانازی‌یەوە قیژاندی . بەرەو کوندڕ ڕۆیی و نینۆکی لە خلیسکی بەردەکان گیردەکردو ...

خۆی گەیاندە جێ . باڵەکانی هەڵبڕی . پڕ بە هەموو سنگی هەوای هەڵمژی . چاوی خۆی دەرەوشاندەوەو خۆی هەڵدایە خوارەوە .

وەك بەرد بەسەر تاوێرەکاندا دەخلیسکا ... زوو بە باڵی شکاوو هەڵوەریوەوە کەوت .

لووزەوی شەپۆل باوەشی بۆ کردەوە . خوێنەکەی داشت . بەرگی کەفی لەبەرکردو بۆ نێو دەریای ڕاپێچا .

شەپۆلەکانی دەریا بە نرکەیەکی خەمگینەوە بە بەردەکانیاندا دەکێشا و ... لاشەی مەلیش لە دەریای مەزندا لەبەر چاو ون دەبوو .

— ٢ —

مارە لە کونەکەیدا بە باڵ‌کەوتنەوە ماوەیەکی زۆر بیری لە مەلەکە کردەوە ... لە بارەی سۆزی‌یەوە بۆ ئاسمان و ...

چاوی بڕی‌یە ئەو دووراییەی هەمیشە دڵنەوایی چاو دەکا بۆ ئاواتی بەختەوەری .

**— چی لەو چۆڵایی‌یە بێ بن و بێ‌سنووردا بەدی‌کرد ئەو هەڵۆیەی وا مرد ؟ بۆچی ئەوانەی وەك ئەو دەمرن دڵیان بە خۆشەویستیی فڕین بۆ ئاسمان خۆشە ؟ چی‌یان لەوێ لێ دیار دەبێ ؟ بهاتایە تاوێ بفڕیمایە بۆ ئاسمان دەمتوانی لەوە هەمووی بگەم .**

ئەمەی وت و کردی بە ڕاست .. خۆی لوول‌کرد . بەرزبووەوە بۆ سەرەوەو وەك پەتێکی بارێك لەبەر تیشکی خۆرەکەدا بریقەی دەهات .

ئەوی بۆ ئەوە هاتبێتە دنیاوە لەسەر سك بخشێ ، قەت ناتوانێ بفڕێ ! ئەو ئەمەی لەبیر چووبووەوە و کەوتە خوار بەسەر بەردێکدا ، بەڵام نەمرد . پێکەنینێکی کرد .

**— فەرموو ! ئاخر فڕین بۆ ئاسمان چ خۆشی‌یەکی تێدایە ؟ لە کەوتنە خوارەوەکەیدایە ! مەلێکی سەیرن ! لە بارەی زەوی‌یەوە ئاگایان لە هیچ نییە ، کەچی کە بە سەریەوە دەبن ، هەوڵ دەدەن بەرزببنەوە ، بۆ ئاسمان بفڕن و لە چۆڵیدا بۆ ژیان بگەڕێن . ئەوێ هەر بۆشایی تێدایە . بەڵێ ، لەوێ**

ڕووناکی زۆرە ، بەڵام خۆراکی تێدا نییە . دابین‌کەری گیانی زیندەوەری تێدا چنگ ناکەوێ . ئیتر شانازی کردن بۆ و ، سەرزەنشت کردن لەپای چی ؟ بۆ ئەوەی نەفامیی خۆیانی پێ‌بشارنەوە و بێ‌کەڵکی‌یانی لە کاری ژیاندا پێ‌داپۆشن ؟ مەلێکی سەیرن ! ئێستا ئیتر من جارێکی‌تر بەو فسانەیان هەڵنانەخەڵەتێم ! من خۆم لە هەموو شتێك دەزانم ! من ئاسمانم بینی .. پێیدا فڕیم . پێوام . لە کەوتنە خوارێ حاڵێ بووم . تێك‌نەشکام ، بەڵام ئەوەندە هەیە بڕوام بە خۆم پتر بوو . با ئەوانەی کە وا ناتوانن زەوی‌یان خۆش‌بوێ ، هەر لەسەر کەلەکبازی بژین . من ڕاستی دەزانم‌و بڕوا بە بانگەواز و هاواری ئەوان ناکەم . زەوی بۆ ئەم گیانەوەرانەیە کە خوا دروستی کردوون . من لەسەر زەوی دەژیم و ....

بە دەم فیز و شانازی بەخۆوە کردنەوە ، خۆی لەسەر بەردەکە گلۆلە کرد .

دەریا دەبریقایەوە . هەموو لا ڕووناك . شەپۆلەکان بە تووڕەیی‌و هەڕەشەوە دەیاندا بە کەنارەکاندا .

لە نەڕەی شێرانەیاندا گرمەی دەنگی گۆرانیی مەلی ئازاد دەهات . تاوێرەکان لە پێداکێشانیاندا دەلەرزین . ئاسمان لە گۆرانیی تووڕە و هەڕەشە دەلەرزی :

**« ئێمە بەستەی شکۆ بۆ شێتێتی چاونەترسان دەڵێین !**

شێتێتی چاونەترسانە گەوهەری ژیان ! ئەی هەڵۆی ئازا تۆ خوێنی خۆت لە جەنگدا لەگەڵ دوژمنان ڕشت .. بەڵام کاتێکیش دێ دڵۆپەی خوێنی تۆ ، وەك پریشك لە تاریکایی ژیاندا دەردەپەڕێ و دڵانی زۆری ئازای تینووی ئازادی و ڕووناکی دادەگیرسێنێ !

با تۆ بمری ! .. بەڵام لە بەستەی ئازا و بەهێزەکاندا هەمیشە دەبی بە نموونەی نەمری ، بە بانگ ڕاهێشتی سەربەرزی و ئازادی ، بەرەو ڕووناکی !

ئێمە بەستەی شکۆ بۆ شێتێتی چاونەترسان دەڵێین ! .. » .

دەریا لە دوورەوە کش و ماتە . شەپۆلی بە ئاهەنگ بۆ سەر لی کەنارەکان دێن‌و ، منیش ، بێ‌دەنگ، بۆ چاونەندازی دووری دەریا دەڕوانم . لە سەر ئاوەکە تا دێ ، پەڵەی زیوین کە لە تیشکی مانگەوە دەکەوێتەوە پتر دەبێ ... مەنجەڵەکەمان لەسەرخۆ بۆ خۆی دەکوڵێ .

یەکێك لە شەپۆلەکان بە عیشوە و نازەوە بارزەقە ئەبەستێتە سەر لێوار و بە هاژەوە خۆی دەگەیەنێتە لای سەری ڕەحیم .

**— بۆ کوێ دەچی ؟ ڕەحیم دەستی لێ‌ڕاوەشێنی – بڕۆ ! ئەویش یەکسەر دەکشێتەوە بۆ ناو دەریاکە .**

بە لای منەوە ئەوەی ڕەحیم کردی کە گیانی کرد بە بەر ئەو شەپۆلەدا ، نە شتێکی کەم بوو ، نە مایەی پێکەنین بوو ، نە کارێکی وایش بوو سڵی لێ‌بکرێتەوە . دەوروبەر گشت بە شێوەیەکی سەرسوڕهێن ، نەرم‌و جوان‌و نازدار بوو . دەریا زۆر سەنگین‌و هێمن بوو . لەو شنەی شەماڵە شێ‌دارەیدا کە بۆ چیاکان دەهات هەڵاوی گەرمی ڕۆژ هێشتا مابوو . لە ئاسمانی شینی تۆخدا نەخشی ئەستێرە زێڕینەکان وەك نیشانەی ئاهەنگ دڵیان دەگەشاندەوە ئەقڵیان بە چاوەڕوانی کردنی بێ پێچ‌و پەنایەکی شیرین سەرسام دەکرد .

هەموو وەنەوزیان دەدا ، بەڵام وەنەوزێکی ئاڵۆزی سڵ.. وا دەهاتە پێش چاو کە لە چرکەی داهاتوودا هەموو ڕادەپەڕن‌و بە ئاوازێکی ڕێك‌وپێك ، بە دەنگێکی شیرین دەچریکێنن . ئەو دەنگانە باسی نهێنی‌یەکانی جیهان دەکەن . لێکیان دەدەنەوەو دوایی وەك ئاگرێکی .

خەیاڵی دەیانکوژێننەوە و سەرنجی دڵ لەگەڵ خۆیان ، بەرز ، بەرەو ئاسمانی شینی تۆخی بێ‌بن دەبەن ، لەو شوێنەوە کە لەنجەی ئەستێرەکانیش لە پێشوازییدا هەروا بە ئاوازی مۆسیقای بێ‌پەردەی سەرسوڕهێن دەچریکێنن .

— ١٨٩٩ —

# خوازبێنی

نووسینی : عەزیز نەسین
وەرگێری : غەریب پشدەری

«نەجدەت» نەك هەر بەدڵێك . بەڵكە بەسەد دڵ شەیدای کچێ ببوو . بیرو خەیاڵی کچە ئارامی شەوو رۆژی لێ هەڵگرتبوو . هەرزەکارەکانیش قۆڵیان نابووە قۆڵی یەکترو سەریان کردبوو سەری . زۆرم زگ بە لەتدەت دەسووتا . رۆژێك ل غساندا لێم پرسی :

– ئەرێ کچەش تۆی خۆش دەوێ ؟

– زۆر . . . ئەوە لەتاوانم دەمرێ !

– دەباشە بیهێنە .

– کەسێ نیە بینێرمە خوازبێنی . دایك و باوکیشم لە (ئەرزەرۆم)ن .

– های بابە تازە ئەو دەورو زەمانە بەسەرچرر . . خۆت بچۆرە لای باوکی . رێك و راست بڵێ : «ئێمە یەکترمان خۆش دەوێ . . بفەرموون پێکەوە زەماوەند بکەین» .

– زیرەکی ! . ! گومانی تێدانیە وەلامم دەداتەوە :

«جا بۆوا درەنگ هاتی» و دەستی کچەکەی دەنێتە دەستم .

– گاڵتە مەکە . . بەخوا بەراستیمە . . ئیشەکە لەمەش ئاسانترە ، خۆ باوکان هەردەبێ کچەکانیان بەشوو بدەن . . . تۆش هەردەبێ ژن بێنی ، ئیدی سەودا لەمە ئاسانتر نابێ .

– ئاخر برادەر . . . من ناتوانم دوو قسان بکەم . . کەیەکێکی لەخۆم گەورەتر دەبینم هەناسەم لێ ، چۆن دەتوانم بچمە خوازبێنی ؟ !

– ئەوە خۆت دەزانی . . هەرکەسە ئیشی خۆی چاکتر دەزانێ ! .

نەجدەت لەسەر ئاوو ئاگران بوو . . لەتاو کچە هەر هەناسەی هەڵدەکێشا ! رۆژێکی تریش هاتەوە لام و وتی :

– بارەکەیم دۆزیەوە . . وەرە هەردووکمان دەچینە لای باوکی ، تۆ لەجیاتی من قسەکان بکە . .

– ئەوە شێت بوویت ؟ من بێم بڵێم چی ؟ ! .

نەجدەت کەوتە پارانەوە :

– قوربانت بم . . تۆ زمانت شیرینە . . دەتوانی باوکی کچە

رازی‌که‌ی ، وه‌ره‌بچین‌و مه‌سه‌له‌که لێك‌هه‌ڵبڕه . کوڕه خه‌ریکه له‌ده‌ست ده‌چم . .

– ئه‌وه قه‌ت ئیشی من نیه . . .

ماوه‌یه‌کی تریش به‌سه‌رچوو . . کچه دواقسه‌ی به‌نه‌جده‌ت وتبوو :

«یاوه‌ره خوازبێنیم . یابڕۆ به‌دوای کاری‌خۆتاو به‌خۆڕایی هیچی تر دو... مه‌که‌وه» . نه‌جده‌ت ئه‌مجاره‌یان هێنده‌م لێ‌پاڕایه‌وه دڵم بۆی توی‌توی‌بوو ، ویستم کارێکی وابکه‌م له‌که‌ری شه‌یتانی بێته خواری وتم : براده‌ر تۆهێشتا سه‌ربازیت له‌پێشه ، کارێکت به‌ده‌سته‌وه نیه ، به‌م حاڵه‌وه ژن‌و ماڵ به‌ڕێوه ناچێ .

نه‌جده‌ت ناوچه‌وانی تێك ناو هه‌ناسه‌یه‌کی گه‌رمی هه‌ڵکێشا :

– هه‌ربۆیه‌شه ده‌مه‌وێ ژن‌بێنم . . باوکی کچه زۆر ده‌وڵه‌مه‌نده ، و ئه‌گه‌ر ببمه زاوای تادواڕۆژی ژیانم نانم ده‌که‌وێته ڕۆنیه‌وه . قوربانت‌بم ، وه‌ره بابچیل ، هه‌رهه‌ناوێکه ، کاره‌که پێك بێنه .

– نه‌جده‌ت گیان وازم لێ بێنه .

– ئاخر خواگیر ، ئێمه براده‌رین ، باشه براده‌رایه‌تی بۆچی‌یه ؟ . ئه‌گه‌ر ده‌ستم نه‌گری‌و یارمه‌تیم نه‌ده‌ی ده‌مرم .

هێنده‌ی نه‌مابوو له‌به‌ر ده‌م‌دا بێته دڵۆپه ئاوێك ، ناچار قبوڵم کرد . . به‌ڵام حاڵ‌و باڵم باش نه‌بوو . . به‌تایبه‌تی پێڵاوه‌کانم زۆر شڕ بوون ، نووکه‌که‌یان پان‌ببوونه‌وه‌و هێنده‌ش له مێژبوو بۆیاغ نه‌کرابوون که‌س نه‌ی ده‌زانی چ ره‌نگێکن ! به‌م جۆره پێڵاوانه‌وه چوونه خوازبێنی نه‌ده‌کرا . پاره‌شم نه‌بوو پێڵاوی تازه بکرم . بڕیارم‌دا له‌دایه‌ره یارمه‌تی وه‌ربگرم .

خوا ماڵی ژمێریاره‌که ئاوه‌دان‌کا ، ده‌ستی به‌سینگمه‌وه نه‌نا ، و فرت‌و فێڵی لێ‌نه‌دۆزیه‌وه ، پازده لیره‌ی یارمه‌تی دام‌و پسووله‌ی بیست لیره‌ی لێ‌وه‌رگرتم که‌سه‌ری مانگ له مووچه‌که‌می ببڕێ ! ڕێ‌و ڕاست چووینه فرۆشگای «برلی مالار» له‌وێ شت هه‌رزان‌بوو . نرخی جووته پێڵاوێکی نمره (٣٧) چوارده لیره‌و حه‌فتاو پێنج قرۆش . . و له نمره ٣٨ وه تا نمره ٤٨ یش ده لیره گرانتر بوو .

له‌به‌ختی من نمره‌ی قاچم سی‌و هه‌شت بوو ، له‌فرۆشیاره‌که‌م پرسی :

«نرخیان چۆنه ؟ !»

ده‌رکه‌وت تانمره (٣٧) منداڵانن ! جابه‌دبه‌ختی له‌وه زیاتر ؟ من له‌به‌ریه‌ك نمره ده‌بێ ده لیره زیاتر بده‌م . ئه‌گه‌ر ئه‌و پاره‌یه‌شم پێ‌بوایه هه‌ر گرنگ نه‌بوو ئه‌ویش باهه‌ر له‌گه‌ڵ ئه‌و پارانه بوونایه که له‌به‌یانیه‌وه تائێواری به‌قوربانی سه‌ری خۆمیان ده‌که‌م . . به‌ڵام به‌د به‌ختیه‌که لێره‌دا بوو که‌هه‌ر ١٥ لیره‌م پێ‌بوو . . . چووینه لای به‌رێوه‌به‌ری فرۆشگاکه‌و تۆزێکمان ئه‌وسه‌ره‌و سه‌رکرد به‌ڵام یارۆ زۆر به‌سارده‌یه‌وه وه‌ڵامی دایه‌وه :

– هه‌قتانه . به‌ڵام من بڵێم‌چی . . هه‌روایه !

من‌و نه‌جده‌ت هه‌رچی که‌لێن‌و قوژبنی گیرفانه‌کانمان گه‌ڕاین‌و پاره‌کانمان تێکه‌ڵ‌کردن ، نه‌کراجووته پێڵاوێکی نمره ٣٨ بکرم .

نه‌جده‌ت وتی :

– نمره (٣٧) بکڕه !

– به‌پێم نابێت !

– له‌به‌ر خاتری من به‌زۆر بیکه‌ره پێت !

– های . . قاچ ، خاترو ماتر نازانێ . . !

– جاخۆ هه‌رده‌بێ کارێکی بکه‌ی !

له‌به‌ر خاتری براده‌رایه‌تی جووتێك پێڵاوی نمره سی‌و حه‌وتم کڕی . . فرۆشیارو نه‌جده‌ت هه‌موو له‌شیان وه‌سه‌ر ئاو گه‌ڕا تا پێکه‌وه توانیان پێڵاوه‌کانم له‌پێ‌که‌ن .

که قه‌یتانه‌کانم به‌ست نه‌جده‌ت ووتی :

- هەستە برۆ .

دوو فرۆشیار قۆڵیان گرتم بڵندم‌کەن . هێشتا لەسەرپێ نەوەستابووم کەهاوارم لێ‌هەستا : ئاخ . . مردم !

فرۆشیارەکە وتی :

- تۆزێك برۆ . . جێ‌ی خۆی دەکاتەوە !

جا بۆ دەمتوانی برۆم ! نەم دەتوانی بەپێوە راوەستم ، جا چ جای رێ رۆیشتن ! وەك نەشتەرم لەمێشکی دەن . . لەهەموو کونەکانی پێستمەوە ئارەق هەڵ دەرژا ! ! ! .

بەم حاڵەوە کەمن خەریکی گیان‌دان بووم نەجدەت هەر دەیووت :

«چۆن سەری قسان دادەمەزرێنی ؟ . . چی پێ دەڵێ‌ی ؟» . کەسواری تراموای بووین وتم :

- نەجدەت خەریکم دەبوورێمەوە . . وەرە ئەمالەم لەپێ داکەنە .

- نا . . دای‌نەکەنی . هەرتۆزێك برۆی گەورە دەبێ .

بەلام پێلاوەکان بیریان بەلای گەورە بوونەوەوە هەرنەبوو . تەنیا یەك رێگا هەبوو کەدەبوایە قاچەکانم بچووك ببوونایەوە . . لەحەزمەتان هاوارم‌کرد : «بێ‌دین وەرە ئەمانەم لەپێ داکەنە» . سواربووەکان هەموویان هاتن‌و دەورەیان لێدام‌و دەستیان بە مەتەڵەك لێدان‌کرد . . بەلام من وانەبووم گوێ بدەمە ئەم قسانە وتم :

نەجدەت وەرە دایان‌کەنە . کەدابەزین لەپێ‌یان دەکەمەوە .

نەجدەت گوێ‌ی نەدایە . بلیت فرۆشەکەو دووسێ‌یەکی‌تر کەدڵیان بۆم بووە کەباب هاتنە یارمەتیم پێلاوەکانم لەپێ دەربێنن . . بەلام هەرچی‌یەکیان‌کرد پێلاوەکان دانەکەندران‌و دانەکەندران . . یەکێ لە نەفەرەکان وتی : «واچاکە پێلاوەکان بدرێنین‌و رزگاری بێت .» وەك فەنەر لەجێ‌ی خۆم راپەریم :

- نا ئەوەی نەکەن . چواردە لیرەو حەفتاو پێنج قرۆشم پێداوە . . بۆ خۆی چاك دەبێ ! ! .

بە ئاوو ناڵەوە لەتراموای دابەزیم . . نەم دەزانی چۆن بەرێ‌دابرۆم . . چارە رەشیەکەش لێرەدا بوو کە نەجدەتیش وازی نەدەهێنام‌و هەردەی‌پرسی :

- نیازت هەیە چ بڵێ‌ی . . ؟ ناکا ئیشەکە تێك‌دەی ! .

گەیشتینە ماڵی بووکێ . . هەرکە چووینە ژوورەوە ، من یەکسەر خۆم‌دا بەسەر قەنەفەکەداو دەستم بەدەم‌و چاومەوە نا .

باوکی کچەکە پرسی :

- براینە چۆنە تەشریفتان هێناوە ؟ .

نەجدەت کەوەك پەیکەرە بەرد دانیشتبوو ، لەژێرەوە سەیری منی دەکرد . وەك ئەو هەتیوانەی کە لە خۆی گەورەترلێ‌یان دابێ ، دەهاتەپێش چاو ! پارانەوەو داواکاریەکی تایبەتی لەدەم‌و چاویا شەپۆلیان دەدا ، دەیویست من وەلامی باوکەکە بدەمەوە .

بەلام من توانای ئەوەم نەبوو لێو هەڵ‌بێنمەوەو قسان‌بکەم ، ئارەقی مەرگم بەناوچەوانەوە بوو . دەم‌وچاوم وەك هەلووژەی رەنگ پەریوبوو . هێندە گەرم داهاتبووم هەرمەپرسە . پلەی گەرمیم گەیبووە چل‌وسێ پلەی گەرمی ! کە نەجدەت دیتی من هیچم لەدەست‌نایە بۆخۆی دەستی بەقسان‌کرد - دایکی کچەش هاتبۆوە ژووری‌کاتێ دیتی وامن بەم جۆرە ئارەق دەرێژم پرسی :

- ئێوە بۆ قسەیەك ناکەن ؟

نەجدەت وەلامی دایەوە :

- ئەو لەشەرمان قسەی پێ‌ناکرێ .

وەك قوتابیان ، لەپێ‌دەستم خستبوە سەر ئەژنۆکانم‌و جینگڵم دەدا . لەو دەمەیدا «بووك»ەخان قاوەی هێنا ، لەژێرەوە سەیرێکی دەم‌و چاوی کچەم‌کرد هێندە ناشیرین بوو واقم ورما : «دەك خوابتکوژێ نەجدەت بۆ خۆت‌و زەوقت ، پیاو بۆ ئەم گورگانە شوێیە هێندە دەناڵێنێ ؟» .

قسەکانی نەجدەت هەمووی گوڵ پژاندن بوو وخەریك بوو باسی ئاسمان‌و رێسمانی بۆ دایك‌و باوکی کچە دەکرد ، و ئەوانیش قاقا پێ‌دەکەنین و منی بێچارەش لەئێش‌و ئازارا موورەی پشتم بروسکەی دەدا . . هێندەی نەمابوو بگریم .

نەجدەت دوای قسەکانی باسی خوازبێنیەکەی هێنایە پێشێ . .

باوکی کچە ووتی :

. . بیری خۆمان دەکەینەوەو وەلامتان دەدەینەوە .

دایکیشی ووتی :

ماوەتە سەر چارەنووس .

دوایی لە منیان پرسی :

– ئێوە چ کارەن ؟

– بێکارم .

لەو بەرێ کردنە ساردەی نەجدەتیان پێ بەرێ‌کرد تێگەیشتین سەودایەکە سەرناگرێ کەهاتینە دەرێ ، نەجدەت رووی تێ‌کردمو بەگرژو مۆنیەوە ووتی :

– ئەمە برادەرایەتیە ! وەك مرواری‌یان لەزاری‌کردبێ ، دەترسای هەر دەمت بکەیتەوەو هەموو هەڵوەرنە سەرزەوی !

نەشی‌هێشت هیچ بڵێم ، ملی رێگای گرت‌و لێی‌دا رۆیی‌و تاكو تەنیا لەناوەراستی کۆڵانێ مامەوە . لەسەر لێواری شۆستەکە دانیشتم ، دەمویست پێڵاوەکان داکەنمو بەپێ‌خواستی برۆم . بەڵام وەك پێڵاوەکان بەپێستی قاچمەوە نووسابن ، هەرنەش‌دەجوولان .

لەبیری ئەوەش‌دا بووم کە چۆناوچۆن بچمەوە دائیرە .

هیچ چارەیەك نەبوو ، لەسەر تەختە بەردەکان درێژبوومو هاوارم‌کرد :

– موسڵمانینە ، خێرەومەندێك فریام کەوێ .

کەس هیچی لەدەست نەدەهات ، هەریەکە قسێکی‌دەکرد ، یەکێ دەیووت :

پارچە پارچەی کەین ، لەمەزیاتر هیچ چارێکی تری نیە .» .

چەند کەسێك بەچەقۆو مقەستەوە کەوتنە گیانی پێڵاوەکان .

ماوەیەك خەریك بوون ، بەڵام بێ‌سوود بوو .

یەکێکی‌تر ووتی :

«وانابێ ، بابیبەینە لای پزیشك پێویستی بەعەمەلیاتە !» .

بەئاماژەی سەر ووتم : «نایەمەلای پزیشك بۆخۆتان چارێکی‌بکەن» لەدوایی‌دا پێڵاوەکانیان پارچە پارچە لەپێستی پێم جیاکردەوە . . سێ رۆژی رەبەق نەمتوانی لەسەرپێ راوەستمو بەرێ‌دا برۆم . . دوایش قاچەکانم هێندە ئەستوور بوون کەلەجیاتی پێڵاوی نمرە (٣٨) ناچاربووم پێڵاوی نمرە (٤٥) لەپێ‌کەم ، هەرتەسکیش بوو ! رۆژی چوارەم کە چوومەوە دائیرە بەردەستەکە ووتی : «پیاوێك چەند جارێك لێی پرسیون» . تازە دانیشتبووم کەپیاوەکە هاتەوە . . باوکی هەمان‌کچ بوو کەچووبووینە خوازبێنی ، هەرچەندە پێشم وتبوو بێ‌کارم نازانم لەکوێی ناوو نیشانی کارەکەم دۆزیبۆوە .

بەروویەکی گەش‌و دڵێکی خۆشەوە هات لەتەنیشت مێزەکەی منەوە دانیشت‌و بەبێ سێ‌و دوو ووتی :

– من‌و ژنەکەم بریارمان داوە کچەکەمان بدەین بەجەنابتان ! . تۆزێکم لەخۆم‌زانی‌و پرسیم :

– جا ، بۆ . ؟

باوکەکە قاقایەکی کردو وەڵامی دایەوە :

– چونکە ئێوەم زۆر وەبەردڵی کەوتووە . بەدرێژایی تەمەنم لاوی وەك ئێوە شەرمن‌و مل‌کەچو لەسەرەخۆم نەدیوە .

ئەو رۆژەی کەهاتبوونە ماڵی ئێمە ، لەشەرمان نێوچەوانتان ئارەقەی دەردابوو ! رەنگی رووتان پەریبوو . . هەر رەنگێکتان دەهێناو رەنگێکتان دەبردو نەتان دەزانی تەنانەت دەستتان بخەنە کوێوە ! لەم‌دەورو زەمانەدا زاوای وەك ئێوە شەرم‌بەخۆ کەم دەست دەکەوێ ووتم :

– خۆ برادەرەکەم ، هاتبووە خوازبێنی ؟

– تکا دەکەم قسەی برادەرەکەتم بۆ مەکەن . . ئەو هێندەی فەرموو سەرمان بەژان‌هات . . من کچەکەم لەتەنەکەی خۆڵ‌دا نەدۆزیوەتەوە ، تا بیدەم بەو !

– قوربان من جارێ تاهێشتا نیازی ژن هێنانم نیە .

چاوێکی گلەییانەی بەروومدا خشاندو وەڵامی دایەوە :

– ئەمە نابێ . . کارێکی باش‌نیە . . . ئێوە ئەگەر ئێستا ژن نەهێنن باشە دەتانەوێ ، کەء بیهێنن ؟ .

سەیوم کرد یارۆ کۆڵ نادا و دەیەوێ کچە تەپیوەکەی بەریشی منەوەکا واچاك بوو کارەکە یەکسەرە کەمەوە . .

تیکەپارچەی پێڵاوە نمرە (٣٧)ەکانم لەسەبەتەی خۆڵی ژێر مێزەکە دەرهێناو لەبەردەمیم داناو ووتم :

ئەمانە دەبینی؟ من هەر شەرمو ئابروویەکی کە هەم بوو بەهۆیئەم نەعلەتیانەوە بوو .دەفەرموون کچەکەتان بدەن بەمانە ! !

یارۆ هەر ژاست بۆوەو یەکسەر لەدەرکێراچووە دەرێ‌و منیش ،خوا بتحەسێنێتەوە .

ئێوەش ئەگەر دەتانەوێ بچنە خوازبێنی‌و هەر سەریش کەون ، پێڵاوی تەسك لەپێ‌کەن . دڵنیابن ئەگەر کچەشتان پێ رازی نەبێدابێ‌و باوکی بەزۆری دەتان دەنێ ! !

---

لە کتێبی «ادمهای عوضی» یەوە کراوە بەکوردی .

## كورته چیرۆك




دوای گەڕانەوەت لە دەرەوەی وڵات ، ویستت سەرێكی ئازادی هاورێت بدەیت بە بۆنەی ژن هێنانەكەیەوە . ئازادی هاورێی منالّیو پێكەوە گەورە بوون « ئەبێ چۆن ژنێكی هێنابێ » باشت ئەناسی لە هیچ هەڵبژاردنێكیدا سەركەوتوو نەبوو ... بە درێژایی رێگەكە نەتتوانی وێنەك بۆ ژنەكەی ئازاد بكێشی بەدەم لێكدانەوەوە گەیشتیتە بەرماڵی ئازادو لە زەنگت دا ئازاد هاتە پێشوازیتو بەرەو باخچە رازاوەكەیان رێنمایی كردی .

پاشان بانگی كرد : فریشتە وەرە میوانێكی خۆشەویستمان هاتووە ، فەرهادی هاوریتم . پاش كە مێك ژنێكی شۆخو شەنگی بالاّ بەرز دەركەوت كراسێكی رەشی میوانداری شەوی لەبەرابوو قژێكی درێژی زەرد بەسەرشانە بەفرینەكانیدا پەخشبوو بووە دوو چاوی سەوز ئەتووت سەوزایی دارستانەكانی تیا تواوەتەوە ... بەرێزێكی زۆرەوە بەخێرهاتنی كردیتو دەستە ناسكەكانی خستە ناو دەستت ...

تۆش سەرسورماوی جوانیەكەی فریشتە بوویت .

فریشتە بەرامبەرت زۆر بە هێمنی لە سەر كورسیەك دانیشتو ئازادیش سەرگەرمی رازاندنەوەی مێزی خواردنەوەبوو تۆش نیگاكانت پەردەی شەرمیان دڕی بوو بێپەروا ئەڕوانیە چاوە سەوزەكانی ئەو تۆبووكە شۆخەی كە جارجار نیگایەكی پڕشەرمی تێ ئەگرتی ... هەر چەندت كرد نەتتوانی بەسەر رێڕەوی نیگاكانتا زاڵبیتو لە تێروانینی فریشتە كۆڵ بدەیت خۆشت سەرت لە خۆت سورمابوو .

پاش كەمێ خەیاڵ كەوتیتە قسە نەتویست هەرچی ئەزانی بیلێیت چونكە فریشتە هاوبیرو باوەڕتبوو گوێگرتبوو ، تەواوكەری قسەكانتبوو ، خۆت بە رۆشنبیرێك ئەزانی كەس شان نەدا لە شانت كەچی وا فریشتەی جوان لە گەڵتا هاوكێشە لات سەیربوو كە ژنێكی وا ئەوەندەش رۆشنبیر بێت .

نەتزانی چۆن ئەو هەموو مەیەت خواردەوەو چۆن شەوت بە رۆژ گەیاندو لە دانیشتنو دواندن بێزار نەبوویت خۆر سپیدەی دا لە كەلی گوێژەوەو ناچاری كردیت كۆتایی بە دانیشتنەكەت بێنی .

* * *

چەشتەنگاوێكی درەنگ رۆیشتیت لە رێگا بیرت هەر لای « فریشتە » بوو . ئازاد ئەمەی چۆن دۆزیەوە چۆنی هێنا ؟ چۆن ئەم پێی قایلبووە ؟ ئەبێ بۆ سامانو پارەكەی بێ ؟ نا ... فریشتە لەو جۆرە ئافرتانە نیە دوای رووكەش بكەوێ ئەگەرچی بڕواشم بە بەختو ناوچەوان نیە بەلاّم ئەمەیان بەختی ئازادەو هیچیكە .

لەوەو پێش لەم شارەدا هەستت بە تەنیاییو نامۆیی ئەكرد بەلاّم ئێستا دلت لە جۆلانەی ماڵی فریشتەدا ئارامی گرتووە « لەوە ئەچێ خۆشم بوێ » هەوڵت دا بیر لەوە نەكەیتەوە « ژنی خۆشەویست ترین هاورێمە » .

بەلاّم كە چاوت بە بالاّ بەرزەكەیو چاوە سەوزەكانی ئەكەوت ئەو بڕیارانەت لەبیر ئەچووەوە دەسەلاّتت بەسەر دلّتا نە ئەما « شەیدای بووم ، خۆشم ئەوێ ، خۆشەویستیەك پاكتر لە دلی منالّو بەتینتر لە ئاگر » . وات هەست ئەكرد كە ئەویش تۆی خۆش بوێ بەلاّم دلت بەرایی نەئەهات ئەو ڕازە سەختە بدركێنی لە كاتی گفتوگۆدا هەمیشە یەكتان ئەگرتەوە بەلاّم لەگەڵ ئازاد



ناکۆک‌بوو ... هەستت بەوەکرد کە نەگونجاون‌و فریشتە ناچاری‌یە لەگەڵ ئازادا ژیان بەسەر ئەبات ئەمەش زۆرتر سزای ئەدای چونکە ئەتزانی فریشتە زێڕەو نرخی زێڕیش لای زەرەنگەرەو ئازادیش لە ئاسنگەر سەخت ترە . ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆشەویستی فریشتە زۆرتر تاختی تەنی‌وتۆش زۆرتر دەرگات لەسەر توند ئەکرد . لەتاو سوتانی دەرونت پەنات ئەبردە بەر مەی‌و بەدمەستیت ئەکرد .

« شیرکۆ »ی هاوڕێت هەستی بەو خەمەگرانەی دڵت کردبوو ئەشی زانی تۆ پەیوەندی خۆشەویستیت لەگەڵ « نازدار » هەیە ، بەڵام خەریکە بەرە بەرە لەبیرت ئەچێتەوە، تا گەیشتە ئەو ئەنجامەی بەئاشکرا لەو بارەیەوە لەگەڵتا بدوێ ، زۆر مەبەستی بوو بزانێ ئاخۆ « فریشتە »ش تۆی خۆش‌ئەوێ بەڵام تۆ خۆت بەدەستەوە نەئەداو ئەتووت « ژنی هاوڕێمە ناپاکی لەگەڵ هاوڕێکەم ناکەم » « وا خۆشیشی‌ویستم بەچی ئەچێ ؟ خۆشەویستیەکی بێ هیوایە » شیرکۆش ئەیووت :

« خۆشەویستی مەرج نیە بۆ هیواو مەبەست‌بێت با خۆشەویستی بۆ خۆشەویستی بێت » بەڵام تۆی خاوەن باوەڕو دڵپاك خۆت‌بەخت ئەکرد لە پێناوی سەربەرزی‌و پاکیا سووتانی خۆت لاپەسندتربوو لە زیزکردنی هاوڕێکەت .

★ ★ ★

ئێوارەیەکی ساردی زستان وەك هەموو جارانی کە نیگای چاوەکانی فریشتە ڕای‌کێشای ، بەسەر هەواری چۆڵاچووی ئازاد تەنهاو کزوتوورەیی لێ‌ئەباری . پرسیت

## ئەرخەوان

چی ڕووی‌داوە فریشتە کوا لە وەڵاما پەرە کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێناو خستیە بەردەستت :

**— فەرموو ، بزانە فریشتە خان چی نووسیوە ؟ بۆ کێ‌ی نووسیوە ؟ .**

کە خوێندتەوە هەستێکی بەتینی خۆشەویستی بە وشە دەربڕاوت خوێندەوە ، ترست لێ‌نیشت‌و دڵت کەوتە پەلە ..

**— بۆ کێ‌ی نووسیوە ؟**

**— نازانم ئەگەر ئەمزانی ؟**

کەمێك هاتیتەوە سەرخۆت بۆ دەربازکردنی خۆشت‌و فریشتەش بەپێکەنینەوە وتت : کەی ئەمە ئەوەی ئەوێ ئەمە پارچە پەخشانێکی جوانەو هیچی‌کە ، کێ ئەڵێ بۆ خۆتی نەنووسیوە ...

**— نا ئەمە نامەیە ، نامەی دڵداری‌یە .**

**— من لەو بڕوایەدا نیم ئەمە نامە بێت ئەگەر نامە بوایە ئەیدا بەوەی بۆی نووسیوە بڕوانە چەند دەمێکە نووسراوە ئەوە ڕۆژی نووسینی لەسەرە .**

کە زانیت فریشتە لەسەر ئەو نووسینە لەگەڵ ئازاد تێك‌چووەو ماڵی بەجێ‌هێشتووە ... لە ناختا هەستت بەتاوان‌کرد .

وات دانا ئەو هەستەی بۆ تۆ دەربڕی‌بێ‌و لەسەر ئەوە ئازاد دڵی شکاندبێ .. بۆیە بە پەلە داوات لە ئازاد کرد کە بچێ بە دوای فریشتەداو بیهێنیتەوە .

◁

★ ★ ★

بەرەو ماڵی باوکی فریشتە رۆیشتیت . لەوێش فریشتەی هێمن و سەلار هەروەك جاران پێشوازی کردیت . لێت پرسی :

**— ئازاد زۆر پەستە بەو نامەیە کە وا گومان ئەکا بۆ یەکێکت نووسیوە ...**

**— نامە نیمو بۆ کەسم نەنووسیوە ... تەنیا هەستی دڵی خۆمەو بۆ خۆمم نووسیوە ، ئایا ئەمە تاوانە ؟**

**— نا .. تاوان نیە بەڵام ئەو هەستە بێ‌گومان بۆ یەکێکە هەرچەند بۆ من ناشێ بپرسم .**

**— بۆ کەس نیە . بێ‌دەنگ بوو چاوەکانی بۆچرکەیەك تێ‌بڕیت .**

هەرچەند توانیت مانای مەنگی چاوەکانی بخوێنیتەوە بەڵام خۆت هەڵەکردو وتت :

**— ئازاد ئێستا هەستی برینداربووەو پێویستە تێ‌ی‌بگەینی‌و داوای لێ‌بوردنیشی لێ‌بکەی .**

**— سەیرە ، بۆچی ئازاد هەستی هەیە تا بریندار بێت ؟**

**— کە وات ئەزانی چۆن شووت پێ‌کرد ؟**

**— باسێکی سەخت‌و دژوارە هەر باسی مەکە .**

**— کەوابێ پەشیمانی ؟**

**— زۆر .**

**— بۆ ؟**

**— بۆ شاییەکی گەورەمان لە نیواندا هەیە ، هەست بە خواست‌و ئارەزووەکانم ناکا .. چاودێری بیرورام ناکا ، سەربەستی لێ‌زەوت کردوم ، ئەیەوێ دیلی ناو چوار دیوارم‌کا ، بێجگە لەمانەش خۆشی هیچ هونەرێکی‌نیە هیچ سەرمایەیەکی نیە دڵمی پێ خۆش‌کەم‌و ئەو پیاوە نیە کە بۆی بژیم‌و بسووتێم بۆی .**

**— باشە ئەی چار ؟**

**— چار : من دیلم هەردوو دەستم لە کەلەپچەو زنجیردایە ،**

**سەرێکی بەدەست باوك‌و براکانمەوەیەو سەرێکیشی بە دەست مێردەوە ، چارم چی‌یە ؟**

**— یاخی‌بە ، ئەو زنجیرە بشکێنە .**

**— یاخی بوونیش زەمینەی خۆشکراوی خۆی هەیە ئەگینا ئەنجامەکەی مل شکانە .**

**— کەواتە ئەبێ سەر بۆ کۆیلەیەتی دانەوێنی !**

**— ناچارم ، چونکە ژنم ، نەکۆمەڵ نەدۆست نەهاورێ هیچ لایەکیان لایەنی ژن ناگرن .**

دەفەرموو تۆ داوای لێ‌بکە با وازم لێ‌بێنێ ، یا ئەوەندە ژیانم لێ‌نەکا بە دۆزەخ .

★ ★ ★

ئازاد نەیتوانی واز لە هیچ کامیان بهێنێ نەفریشتەو نەگومان ژیانی پڕ شەرابی تاڵی فریشتەش دووبارە دەستی پێ‌کردەوە .

★ ★ ★

ئەو شەوەی بڕیارە سەختەکەتدا چوویت بۆ ماڵی فریشتە دوا دیدارەو رێگە سەختەو توێشو پێویستە بۆیە لە جاران زیاترو بە پەرۆش‌تر چاوت لە چاوە گەشەکانی فریشتە بڕی ، پەست بوویت فرمێسك لە چاوەکانتا قەتیس مابوو ... خەم هەرەسی بە ئارامی گیانت هێنابوو ، چی‌تر خۆت پێ‌نەگیراو لە هەلێکا فریشتەت بە تەنیا گرت‌و پێت ووت :

**— فریشتە ، رازێك لەدڵمایەو لە مێژەوە سزام ئەدا ئیتر توانام نەماوە لەمە زیاتر پەنهانی‌کەم ..**

فریشتە چاوەکانی هێندەی‌کە گەش کردەوەو وتی فەرموو : وتت بەیانی ئەرۆم ..

**— لەبەر چی ؟**

**— لەبەر تۆ ؟**

**— لەبەر من بۆ ؟ تێ‌ناگەم .**

**فریشتە خۆشەویستیت هەموو گیانمی تەنیوە ناتوانم بەرهەڵستی بکەم لەوە ئەترسم لێرە بمێنمەوە تووشی هەڵەیەك بم لەگەڵتاو تووشی سزایەکت بکەم هیچ رێگەیەکم نەدۆزیەوە بۆ راکردن لەم عیشقە پیرۆزە تەنیا دوورکەوتنەوە نەبێ ئەرۆم بەڵام بزانە کە زۆر زۆرم خۆش ئەوێ‌ی‌و هەرگیز بیرم‌ناچێتەوە .**

فریشتە فرمێسك زایە چاوی‌و بەڵام خەندەی لێوە ئاڵەکانی بەربەستی‌کردو وتی : دەمێکە نیگای چاوەکانتم خوێندۆتەوە ورێزم بۆ بەرزی‌و پاکیت داناوە ، ئاگام لێ‌تە خۆت ئەسوتێنی لەپێناوی ئەوەدا ناپاکی لە هاورێ‌کەت نەکەیت سەری رێزت بۆ دائەنەوێنم‌و ئەوەش بزانە منیش زۆر زۆرم خۆش‌ئەوێ‌ی ،

هەستی نامەکەش هەر بۆ تۆ بوو بەڵام نەم ئەویست ئەم رازەت لێ‌ئاشکراکەم نەکا لە رێزو بەرزیت کەم‌کاتەوە .

دوو مرۆڤی دڵپاك‌و راست عەشقێکی پیرۆز پێکیەوە بەستبوون بەڵام مرۆڤی خاوەن باوەڕ جلەو بۆ ئارەزووی نابەجێ شل‌ناکا بۆیە هەردوکتان لە خواحافیزی کردن‌دا بەنیگایەکی بەتین دڵی یەکتان خوێندەوەو بەسزاوە لێك‌بڕان .




من تو د ڤێی
ئەی یــار
ل دەمێ هەناسە دێت و د چیت
ئەو هەوایێ دگەل خوینا من تێکهەلدبیت
هەر ذەرەیەك ...
صەد وێنێن تە یێ د ناڤدا هەین
هەمی رەهو سێلیوێن گیانێ من
د ئامادەنە ... هەمی دەما ... هەر د بێژن
من تو د ڤێی

* * *

ئەی یــار
ل دەمێ زاروییێ و ... گەنجییێ ..
تا ئەڤروکە ... کو بو پیریێ د چم
هەمیشە د ناڤ خەرەند و پێچێن مێشکێ مندا
صەد شیعر و ئاواز
ل سەریەك بێ د کومبین
صەد جارا ل دەقیقێدا
دگەل ترپێن دلێ مندا
گازی دکەن ... من تو د ڤێی

* * *

ئەی یــار
ئەڤرو و سوبەی ... تا ئەز هەمە
چەند پارچە نانا ئەز بخوم
د ناڤ دەڤیدا ... ب دودانا بێنە هێران
ل گەریێ دا رێکێ بگرن و بچنە خارێ
تا د گەهنە گەدە و ریڤیا
صەد ترش و تال ل یەك ب بژێنن
ل دی دەمی ئەو پارچە نان
هەر پێ دکەنن ... هەر پێ دکەنن
چونکە د زانن ئەو ژیانێ بو من دینن
تا ب هێزبم ... پر قوەت بم
دا بتوانم ل هەمی دەما
ب بێژم و هەر گازیکەم
یارا منی من تو د ڤێی

* * *

ئەی یــار
ئەگەر ئەز مرم
بیر و وێنێن تە دگەل هەناسا خوە ..
دێ تێکشێلم .. دێ راگرم
ل دەمێ من د گوریدا ڤەدشێرن .. ◁

هەمی دەما ل بیرا من بی
گەر جارەکێ ئەتو هاتی
ب دل نەرمی ... سلاڤەکێ ل من بکەی
ل دی دەمی هەناسا
خۆ دێ بەرڤەدەم
بینە گولەك ... ل دی کاتی شین ببیتن
ب بێژتە تە
یارا منێ ... ل پاش مرنێ ژی
هەمی دەما ... من تـو د ڤێێ .

* * *

( ٢ )

ئەی یـار ...
راوەستە ... گیان ..
نەچە هیشتا زوی‌یە
گەر چ د زانم هاتنەڤا تە نیە
چەند بچی ... خو دویر بکەی ...
دێ ناچار بی ... دێ هێیەڤە
بەلێ .. ها ... ها یارێ ..
راوەستە ... نەچە هیشتا زوی‌یە

* * *

ل دەمێ تو جوی و ... جودا بوی
وەکی کورەکێ نەزانی
د باژەرەکێ مەزنی‌دا

هەر د زڤرم و
دەست ب دیوارافە
گوهـ ڤەکری ... !
بەلکو ناڤێ تە
ل سەر ئەزمانێ زاروکەکی
من گوهـ لێ‌بیت

ب دل و ئەزمان هەر بێژم
رولە گیان ... ئەی دوست ..
دی ناڤی دوبارەکەڤە
گەر گوتی دێ چم ...
ئەز دێ بێژمێ ...
راوەستە ... ب بێژڤە .. نەچە
هێشتا زوی‌یە

* * *

ل دەمێ تو جوی و ... جودا بوی

وەکی گەر و لالەکێ بێ مێشك
د جادەیێن پر هەرادا
هەر د زڤرم ... هەر د گەرێم
چاڤ ڤەکری .....
بەلکو وینا تە ...
ئەو جلگێن ل بەر تەدا
مروڤەك وەکی تە بیت
وەکی تە ل ریکێ بچیت
ل رەوشتی وەکی تە بیت
ئەز ببینم
ب پەلە و غاردان راوەستینم
ب ئیشارەت و بێ‌ئەزمانی
ئەز ببێژم
تو خودێ راوەستە
دا ل قامەتاتە ئەز تێر ببم
گەر وی گوتی ... بو ... ؟
ئەز دێ بێژم ... تو وێنا یارا منی
گەر گوتی ئەزێ ب لەزم
ئەز دێ بێژم
تو ب خودێ نەچە وەکی یارێ
هێشتا زوی‌یە

* * *

ل دەمێ تو جوی و جودا بوی
هەمی وەختا د خەونادا ئەز د مینم
شەف و روژا تە د بینم
دشێژم بچم ...
دگەل مروڤێن بەرگرێ ل مافێ خوە دکەن
جەنەکی هەلگرم
نامە و کاغەزەکێ بنڤیسم
د بەریکا خوە دا ...
ئەز ڤەشێرم
ل سەنگەرێن بەرگرێن حەڤیێ‌دا
ئەز ب خەبتم
گەر گولەیەك سینگێ کونکەت
ئەو کاغەز ژی کونکون ببیت
ب دلوپێن خوینا من پر رەنگ ببیت
هەر دەمێ هەڤال بهێن
جەك و جلکا ل من هەلگرن
کاغەزا تە د ناڤدا ب بینن ...
بو تە رێ کەن
دا بزانێ یارا منێ

ل دەمێ کاغەزا ب خوینێ رەنگ کری ...
تو بخوینی ...
چاك بزانی
تو و ماف و حەق و وەتەن یەکێن
جوجارا ژ یەك نابن
گەر تە ڤیا کاغەزێ ژی
بدرینێ ... یا هەلگری
د ناڤ هێلێن کاغەزێدا
ئەز دێ دەرچم ... تو دێ بێژم ...
راوەستە گیان ... نەچە هێشتا زوی‌یە
ئەلەك ئاخفتنێن د ماین
دا ب بێژمەتە ... پەلە چیە

گەر چ د زانم ؟... دێ تو هەر چی
تو گوهـ نادەی
دێ دویر کەڤی و ..
هاتنەڤا تە نیە
بەلی .. ها .. ها .. یارێ راوەستە ... نەچە
هێشتا زوی‌یە

* * *

(٣)

ئەرێ یارێ ..
تو نەبێژە بو تو د گری ... ؟
ئەڤان روندکێن وەکی دوڕا تو دادباری
ل سەرێ ریا هەر گازی دکەی
هەر د نالی ب چاڤێن پر خوین
نێزیك نابی نا تەبتی .... هەر ل غاری
یارا منێ
ئەو ئرمێسکێن ئەتو د بینی
ل بەر تە نە ... ئەو بو تە نە
ل بەر پێت تە نە ...
تو نا بینی .. ؟
گەر وان روندکا ... ئەوێن پر خوین
باغەکێ هێشك پێ ئاڤبدەن
گومان نیە ... دێ بیت بەهار
گول دێ شین بن و پر پێبهن و رەنگ
دل دێ خوشبن نامینن کین .

* * *

ئەرێ یارێ ...
تو نە بێژە تو بی ستری
سەرێ تیژی تشتی د دری
ناراوەستی ب ئارامی هەر د بری
بو ... تو وەسا هەر بێهاری ...
نا د بری

یـارا منێ
گەر درێبم تو ب بینە
کا ل کی جیهی ئەز شین بیمە
ب ئارامی ل بن سێبەرێ
ئەو سێبەرا گول چێ د کەن
ما تە ژ بیرکر جانا منێ
کا گولا من ل کێری‌یە ...
کا ئەو کی‌یە

یـارا جوان
ئەو گول تویی ... هەر تو ب خویی
گەر جارەکێ ئەزێ تیژ بم
دا ئەو دەستێن د ڤێت جانێ
ل من ژێ ڤەکەن .. ل من ببرن
وان ب برم
گەر جارەکێ ئارام نەبم
تو بزانە ئەو گورگ و مار
ل دورێن تە ... زرو د هارن ..
هەر د زڤرن
ئەز ل وێ هندێ ... شەپرزەمە
بێ ئارامی ئەز بوڤەمە
هەمی دەما پاسەڤانێ ... گولا خومە
گەر جارەکێ ئەزێ هاربم
تو بزانە جانا پەری
ئەزێ بێوار .. دگەل گولەکێ
گەر هار نەبم ... !
وێ گولێ ژی دێ ژ من سطینن
جهوا یارێ نەبمە ستری
ل دورێن گولێ هەر ب زڤرم
جار جارە ژی ب ئارامی
ل بن سێبەرێ ...
بو خوە بنڤم

* * *

« ئەڤ سـەیرانە دگەل یارێ دا ل دوماهیـا سـالا ١٩٧٩ و سەرەتا سـالا ١٩٨٠ یا هاتیـە نڤیسین » .

/ شانۆگەری /

# بەزۆر کراو بە دوکتۆر

**نووسینی : مۆلیێر** — **هیوا عمر احمد له ئینگلیزییەوە کردوویەتی بە کوردی**

★ **لەم کتێبەی خوارەوە کراوە بەکوردی [ ١٦٥ - ٢٠٠ ]**

**The Misanthrope and other plays**
**Moliere**
**Penguin Classics**
**Translated with on Introduction by**
**John Wood**
**1959 - England**
**Page : 165 - 200**
**A Doctor in Spite of Himself**

★ **پالەوانەکان**

**سگاناریل : داربڕ**
**مارتین : ژنی سگاناریل**
**ڕۆبەرت : دراوسێیانە**
**جیرۆنت : کابرایەکی سامان دارە**
**لوسیند : کچێتی**
**لیاندر : دلداری لوسیندە**
**ڤالێری : سەرکاری جیرۆنت**
**لۆکاس : هاوڕێی ڤالێری**
**جاکلین : ژنی لۆکاس**
**تیبۆ : گوندنشینێک**
**پێرین : کوڕی تیبۆ**

★ **پەردەکان**

**یەکەم : دارســـتان**
**دووەم : ژوورێکی مالی جیرۆنت**
**سێهەم : باغچەی جیرۆنت**

## پەردەی یەکەم

**سگاناریل و مارتین ، بەشەڕە قسەوە دێنە سەرشانۆ**
**سگاناریل : من شتی وا نازانم ، من پیاوم پیاو .**

مارتین : بۆ ئەوە شوم پێنەکردوی گوێ لەم قسە هیچ و پوچانەت بکرم . چیم پێ وتی بلێ بەلێ .

**سگاناریل : ئەمەیە دەردەسەری ژن هێنان . ئەرستۆ چەند ڕاستە ووتوویەتی : ژن یاوەری شەیتانە .**

م : دەوەرەگوێ لەم بلیمەتەو ئەرستۆ سەر ناسینەکەی بکرە .

**س : بەلێ ڕاستە من بلیمەتم . داربڕێکم ، هەموو جیهان تیا نییە . شەش ســـال یاوەری پزشـــکێکی بەناوبانگ بووم . لە منالییەوە هەموو ڕێزمـــانی - لاتینی - وەك ناوی خۆم ئەزانم .**

م : سندانم‌دا لە پیاوی کەوج .

**س : سندانم‌دا لە تۆ ، چەند ژنێکی هەراش و زمـــان درێژی .**

م : ئەو ڕۆژەم بە قوڕگرت ، قایل بووم شـــــووت پێبکەم .

**س : مالی ئەو کابرا مارەبڕەم وێرانکرد ، پســـولەی مارەبڕینەکەی پێمۆرکردم .**

م : سوپاسی خوا بکە ، ئافرەتێکی وەکو من ژنتە .

**س : بەختەوەرم بەوەی تۆ ژنمی . بەلام وام لێ مەکە**

**قسەبکەم .**

قسەی چی ؟

**نا وازبێنە بـا نەیکەم . خۆم ئەزانم چی ئـەزانم .**

**سوپاسی خوا بکە تووشی من بووی .**

لەسەر چی سوپاسی بکەم . داوێن پیس ، چەپەڵ ؛ لەوە زیاتر چیم لێ ئەکەی ! کردومت بەکارەکـەر . هەمیشە دەنوکت لەسەرمە .

**درۆیـە .**

هەموو کەل و پەلی ماڵەکەت فرۆشتووە .

**ژیان بەسادەیی خۆشە .**

دەستێ نوێنت تیا نە هێشتووە .

**هەموویت بۆ ئەکڕمەوە .**

جیت لە ماڵەکا هێشتووە .

**وا بەختەوەر ئەبین .**

شەوورۆژ ئەخۆیتەوەو قومار ئەکەی .

**وانەکەم گیانم ژەنگ ئەگرێ .**

ئەی من چۆن خێزانەکەم بێ بەخێو ئەکرێ ؟

**بە ئارەزووی خۆت .**

چوار منالم بەسەرشانەوەیە .

**دایانگرە سەرزەوی .**

هەمووکات بۆ نان ئەگرین .

**لێیان بدە . من ئـەرکی خـۆم بـەجێهێنـــاوە .**

**هەموویانم بەختەوەرکردوە .**

نیازت وایە هەروا بەسەرخۆشی بیبەیتەسەر !

**ئافرەت مەیئاڵۆزکێنە .**

ئامادەم ئەبێ گوێ تولاغی قسە هیچو پوچەکانت بەو چاو لە چەپەڵیو بێئابڕوویی بەکەمت بنوقێنم .

**ئافرەت ، پەستم مەکە .**

خۆم ئەزانم ، چۆن ئەت هێنمە ژێربار . تا ئەرکی مێردایەتی خۆت بزانی .

**گیانەکەم چیئەزانی ؟ . ئەوە ئەزانی گوێ نادەمێو ماسولکەی باسکم بەهێزە .**

جیت لە دەستدێ ؟ .

**دڵەکەم ، ژنە بچکۆلەکەم ، سـەرت لـە ئـازاوە ئەخورێ .**

پیشانت ئەدەم لێت ناترسم .

**چاوەکەم ، تۆ شەڕ ئەفرۆشی .**

م : هەڕەشەو گوڕەشەی ناوێ .

س : **دڵەکەم ، مستەکوڵەیەکت تێسرەوێنم !**

م : سەر خۆش .

س : **تەمێت ئەکەم .**

م : تا بینە قاقات تێناوە .

س : **پێستت ئەگوڕووم .**

م : دەعبایەکی سەیری .

س : **داروفەلاقەت ئەکەم .**

م : بێ ئابڕوو ، بێلانە ، چەپەڵ ، کوندەپەپوو ، دزی دەسبڕ .

س : **( تێلایەك هەڵئەگرێو پیـا ئەکێشێ ) : کـە والـە حەزبەمە ئەکەیت .**

م : ئۆو . ئای . ئۆو .

س : **ئاوا تەمێت ئەکەم .**

**★ ڕۆبەرت دێتە سەرشانۆ ∴**

ڕۆبەرت : وای وای وای. ئەمەتان لەسەر چییە . شەرمە ، شورەیییە . چەنـد پیاوێکی چەپەڵو توڕەوتڕۆی وا لە ژنەکەت ئەکەیت .

م : ( ڕوونەکاتە ڕۆبەرت . دەستی بەرز ئەکاتەوەو شەقا زللەیەکی لێئەدات ) : من خۆم ئـەمەوێ لێمبدات .

ڕ : کەواتە قسەم نەما .

م : تۆ بۆ خۆت تێهەڵ ئەقورتێنی ؟

ڕ : من هەڵەم .

م : هیچ پەیوەندی بە تۆوە هەیە ؟

ڕ : نە خێر ، تۆ ڕاستئەکەی .

م : زمان درێژی . ئایەلی مێرد لە ژنی خۆی بدات .

ڕ : داوای لێ بووردنت لێ ئەکەم .

ڕ : هیچ .

م : کێ پێی ووتووی ببیتە کەوچك !

ڕ : کـەس

م : ئاگات لە ئیش و کاری خۆت بێ .

ڕ : ئیتر قسە ناکەم .

م : من حەز ئەکەم لێمبدات .

ڕ : زۆر چاکە .

م : خۆلە تۆ نادات .

ڕ : زۆر ڕاستە .

م : گێلە ، خۆت لە کاری خەلکی هەڵ مەقورتێنە .

**« شە قازلەیەکی لێئـەدا ، ( ڕوبەرت ) بەرەولای [ سـگاناریل ] ئـەچێ . ئەویش دەستی بۆ دائـەهێنێتەوەو تێلایەکی لێئەداو ناچاری ئەکات ◁**

**رابكات » ..**

هــاوەلــەكــانم : داوای لێبوردنت لێنــەكـــەم .
بە ئارەزووی خۆت لێی‌بــدە ، دەردی دلی خۆتی
پێبڕێژە . ئەگەر ئەتەوێ یارمەتیت‌بدەم .
نە خێر پێویــستم بە یارمەتی تۆ نی‌یە .
ئەمەیان شـتێكی‌ترە .
لێی ئەدەم ، لێی‌نادەم ، ئارەزووی خۆمە .
زۆر چاكە .
ژنی منە ، هی تۆ نی‌یە .
گومانی ناوێ .
بە قسـەی تۆ ناكەم .

بێ‌گومان .
یارمەتی تۆشم ناوێ .
باشە ، ئەمە بۆ من چاكترە .
كەوجە ، خۆت لە كاری خەلكی هەلمەقورتێنە .
ئەزانی قەیـــەر لەم بارەیەوە ئەلێ چی ؟
**« لە ڕۆبەرت ئەسرموینێو دەری ئەكاتە دەرەوە »**
( ئەگەڕێتەوە لای ژنەكەی‌و دەســـــتی ئەگرێ ) :
دەستت بێنە با ئاشت بینەوە .
پاش ئەوەی دەردی دلی خۆت پێڕشتم ؟
هیچ نەبوو ، دەسـتت بێنە .
ئاشت نابمەوە .
ئێی .
نـــا
دلەكەم ، ژنە بچكۆلەكەم .
یەكجار ، وانا .
دەی با ئاشت بینەوە .
نا ئاشت نابمەوە .
وەرە دەی وەرە .
من لێت ڕەنجاوم‌و بەڕاستیمە .
بەهـ . چی‌بووە ؟ . با ئاشت بینەوە .
وازم لێ بێنە .
دەی با تەوقەیەك بكەین .
خراپ لەگەلما جولایتەوە .
باشە ڕاستئەكەی . بمبورە ، با تەوقەكە بكەین .
لێت نـەبوردم ـ لــە ژێــر لێــوەوە ئــەلێ ـ بــەلام
هەركوێشی مەدەرێ . ئەم جۆرە شـــــتە بچوكانەی
وەك مــــتەكۆلەو داركاری ، لەنێو ژن‌و مێردا ئەبێ.
وەك خوێی چێشـــــــــــتوایە . دەمە زەردی
خۆشـەویستی‌یە كەمان ئەكاتەوە . من ئێستـا ئەچم
بۆ داربڕین . بەیمانت ئەدەمێ پێش خۆرئاوا بوون،

سەدبارەدارت بۆ بێنمەوە . ( ئەچێتەدەرەوە )

م : ئایەلم وەك بەرزەكی بانان بۆی دەرچی . ئــەمــەم
لەبیر ناچێتەوە . ئەبێ ڕێ‌یەك بدۆزمەوە ئەم دڕكەت
لە ژێر پێ دەربهێنم . هەمیشـە ڕێوشوێنی تایبەتی
خۆمان هەیە بۆ تۆلە ســـەندنەوە لە مێردەكانمان .
ئەبێ تۆلەی لێ بكەمەوە . ئەو ئازارەی پێ بچێژم
كە پێی چەشتم .

### ★ لۆكاس‌و ڤالێری دینە ژوورەوە ★

**لۆكاس : نازانم ئێمە سەرە خولێی چیمانە . بەدرۆ بۆچی خۆمان ماندوو بكەین ؟**

ڤالێری : پیرە مێرد ، ئەوە ئەلێی چی ؟ . ئەبێ گوێڕایەلی
فرمانی ئاغامان بین‌و بەتەنگ تەندروســـتی خاتونی
كچی‌یەوە بین . ئەمــە ڕێ بۆ شووكردنەكەی خۆش
ئەبێ‌و ئێمەش شتێكمان دەستئەكەوێ .
خاتون دلی بە ـ لیاندر ـ ەوەیــە . باوكی ئەیەوێ
بیدات بە ( هۆراس ) كـە كابرایەكی دەولەمەندە .
هەرگیز نایدات بە ـ لیاندر ـ كە وەكو ســــــلق
ڕووتە .

م : لەبەرخۆیەوە ئەلێ : تۆ بلێی ڕێگایەك ئەدۆزمەوە ،
تۆلەی خۆمی پێبكەمەوە ؟! .

ل : بە ڤالێری ئەلێ : بەلام نیازی چی‌یە . بۆچی دكتور
ماوە ئەهاتبێتە سەر خاتوون‌و بێ سودیش بووە .

ڤ : لەوانەیە گـەر بگەڕێین ، لــەم كوچەو كۆلا نــانــەدا
شتێكی وا بدۆزینەوە كاری وا بكات لە دەســـــتی
بەناوبانگترین دكتۆر نەیەت .

م : هێشتا قســـە بۆ خۆی ئەكات : هەرچۆنێ بێ ئەبێ
تۆلەی لێ بكەمەوە .
هەروا بە ئاسانی لەبیرم نـاچێتــەوە . ( لۆكـاس‌و
ڤالێری ئـەبینێ ) ئاهـ ، بەڕێزان ببوڕن ، ئێــوەم
نەدی ، بیرم بە تەنگ‌و چەلەمەیەكەوە خەریك‌بوو .

ڤ : هەمووكەسێ تەنگ‌و چەلــەمــەی خۆی هــەیــە .
ئێمەش بە دوای شـــــــتێكدا ئەگەڕێین . زۆر
بە پەرۆشین بیدۆزینەوە .

م : ئەتوانم یارمەتیتان بدەم ؟

ڤ : لــەوانــەیــە . ئێمە بەدوای كـابرایــەكی زیرەكدا
ئەگەڕێین . باشتر بلێین بەدوای ـ دكتۆر ـ ێكدا
ئەگەڕێین ، چـارەی نـەخۆشـــی خـاتـونی كچی
ئاغامان بكـات . توشی دەردێكی وابووە ، زمـانی
گۆنـاكـــات . زۆر دكتۆر ـ مان ێ بانگ‌كردوە ،
بەلام كەسیان پێیان چار نەكراوە . لــە وانــەیــە
یەكێــك بدۆزینــەوە ، نهێنی‌وا بزانێ ، دەرمانێكی

تایبەتی خۆی هەبێ . چاری زۆرشتی وای پێبکات،
دکتۆرەکانی تر نەتوانن چاریبکەن .
لەبەرخۆیەوە ئەڵێ : خوا ناردونی .
ڕوونەکاتــە ڤالێریو لۆکاس : کەسی وەك منتــان
دەســـــت ناکەوێ . ئەوکابرایەتان پیشانبدات .
کابرایەك هەیە ، ئەوپەری بلیمەتەو سەری لە هەموو
نەخۆشــــــییەك دەرئــەچێ . وێنەی نییــە بــۆ
چاككردنەوەی نەخۆشییە هیوا لێ براوەکان .
تکایە لە کوێ ئەیدۆزینەوە ! .
لەم ناوەدایە خەریکی داربڕینە .
دکتۆرو داربڕین ؟! .
مەبەستی گژوگیا کۆکردنەوەیە .
نە خێر ، داربڕین . کابرایەکی ســەرسوڕهێنە .
سەری لەم جۆرە کارانە ئەخورێ ، زۆر ســـەیرو
خەیاڵبازە ، لە هەموو کارێكدا وەستایە . حەز بە
جلوبەرگی عەنتیکەو شروشیتاڵ ئەکات . تا خەڵکی
نەیناسنەوە کە چ بلیمەتو خاوەن بەهرەیــەکــە .
زۆری پێ ناخۆشە باسی ئەو بەهرانەی بکەی کە خوا
داوێتێ .
شــتێکی ئاشـــــــکرایە ، پیاوی گەورە ، جۆرە
سەیرییەکیان تیایە . شــارەزاییەکەیان ئالودەی
جۆرە شێتوویتییەکە .
شێتوویتی ئەمکابرایە وێنەی نییە . ئەبێ ئازار
بــدرێو فــەلاقــە بکرێ تا دان بــە بــەهرەوەریو
شارەزایی خۆی دا بنێ . قــــــەی خۆمان بێ ،
هیچتان لێ چنگ ناکەوێ ، دان بەوە دانانێ کـــە
دکتۆرە ئەگەر دارو فەلاقەی نەکەن . ئێمە خۆمان
هەر کە پێویــستمان پێی بوو . بەم شـــــێوەیە
ئەیهێنینە ژێربار .
چ خولیایەکی سەیرە .
ڕاستە ، بەڵام ســــــەرەنجام کاری وای لێئەبینن
سەرتان سورئەمێنێ .
ناوی چییە ! .
پێی ئەڵێن – سکاناریل .. بە ئاسانی ئەیدۆزنەوە.
ڕیشێکی پانوڕەشی هەیە . تورەکەیەکی لەملدایە .
جلوبەرگی سەوزو زەردی لەبەردایە .
بە ڕاستی زیرەکە .
بۆچی نا ، کاری وا ئەکــات . بــە بیری مــرۆڤــدا
نایەت . شەش مانگ لەمەوبــەر ئــافرەتێك مرد .
خەریك بوو بینێژن . بەڵام پاش شەش کاژێر یان
زیاتر ئەم دکتۆرەیان بردەسەری . سەیرێکیکردو

دڵۆپێك دەرمـــــانی کردە ناودەمی . ژنەکە زیندوو
بووەوە . بەرزە پێ ڕاستبووەوە کەوتە هاتوچۆ
بە ژوورەکەدا ، وەك ئەبای دیبێو نە بۆران .

ل : ئۆو

ف : ئەبێ ئەو دەرمانە گیراوەی ئالتون بووبێ .

م : لەوانــەیــە . سێ هەفتە لــەمــەوبەریش کوڕێکی دوانزە ســــاڵ ، لەسەربانی کڵێسـەوە کەوتبووە خوارەوە . کەللەی وردو خاشبوو بوو ، دەستو قاچی پارە پارە بووبوو . کــە هــاتن ئــەم کابــرا ســــەیرەیانبرد . هەندێ – مــەلحەم – ی لـــە دەستیداو دەستی هێنا بەسەر لەشیا . کوڕەکـــە هەستایە سەرپێ وتڕی تەقاند یاریبکات .

ل : ئۆو

ف : لەوانەیە نهێنی هەموو پزیشکایەتی بزانێ .

م : بێگومان . دڵنیام .

ل : ئەمە ئەو کابرایەیە ئێمە ئەمانــەوێ ، با بڕۆین زوو بیدۆزینەوە .

ف : زۆر سوپاست ئەکەین . بۆ ئەم یارمەتیەت .

م : لە بیرتان نەچێ ، چیم پێووتن وابکەن .

ل : مەترسە ، وەستاین لە لێدانو دارو فەلاقەکردندا .

ف : زۆر باش بوو ، ئــەم خانمەمـــــان دی . ئومێـــدم بەیاکرد .

**★ مارتین ئەچێتەدەرەوە ، سکاناریل دێتە سەر شانۆ ، شوشەیەکی بەدەســــــتەوەیە گۆرانی ئەڵێ :**

س : **لە لە لا .**

ف : گوێ بگرە ، ئەوەکێیە گۆرانی ئەڵێ ؟

س : **لە لە لا ... کارێکی زۆرمکرد . با پشوویەك بدەم – شوشەکە ئەنێ بەسەرییەوە – داربڕیــن مرۆڤ زۆر ماندوو تینوو ئەکات – گۆرانی ئەڵێ :**

**شــوشــە بچکۆلەکەم لەدەستدایە**
**گــوێ لــە خوڕەی مەی بگرە لــە**
**قورگمدا ئۆو چەند بەختەوەر ئەبم**
**ئەگەر هەر قوومت لێ بدەمو هەر**
**پڕبی .**
**ئۆو چەند بەختەوەر ئــەبم نازانم**
**بۆ وا نەبێ .**
**باشە گەیشـــــتینەکوێ ، نابێ خۆم تووشی ماخۆلان بکەم .**

ف : کابرا خۆیەتی .

منیش ئەڵێم خۆیەتی ، با دەست پێبکەین .
: با چاك لێی ورد بینەوە .
: **( ئەیان بینن . یەکە یەکە لێیان ورد ئەبێتەوە ، دەنگی‌نزم ئەکاتەوە ) : ئۆو جنۆکە بچکۆلەکەم . چەندە حەزم لێتە ، شوشە بچکۆلەکەم ـ گۆرانی ئەڵێ :**

**« چەندە بەختیار ئەبم ئەگەر ... »**

**تۆ بڵێی ئەم کابرایانە چییان بوێ ؟**
: بەئەواوەتی خۆیەتی .
بەڵێ هەر ئەوکابرایەیە ، خانمەکە باسی‌کرد .
: **لەبەر خۆیەوە ، باسی من ئەکەن ، سەیری من ئەکەن ، چییان ئەوێ .**

**[ شوشەکە دا ئەنێ ، ڤالێری ئەچەمێتەوە ڕێزی خۆی بنوێنێ . وا ئەزانێ شوشەکە ئەبات . هەڵی ئەگرێو ئەیخاتە ئەولایەوە . لۆکاس ـ هەمان شت لەلاکەی‌ترەوە ئەکاتەوە ، سگاناریل ، شوشەکە هەڵئەگرێو ئەیگرێ بە بەرسنگی‌یەوە ] .**

قوربان تۆ ـ سگاناریل ـ یت .
: **لە پێشەوە سەیری ڤالێری ، دوایی سەیری لۆکاس ئەکات ، ئەوم ، ئەونیم ، بزانم چیتان ئەوێ ؟**
ئەمانەوێ ڕێزو بەپەرۆشی خۆمانت بۆ دەربڕین .
**کەواتە من ئەوم .**
زۆر دڵشادین بە بینینت . ئەختێ کارمان پێت هەیە . هاتووین دەستی یارمەتیمان بۆ درێژکەی .
: **بەڕێزان گەر بە من بکرێ ئامادەم .**
قوربان ، زۆردەستو دڵباشی .
قوربان شەبقەکەت لەسەر کە با خۆرەتاوەکە ئازارت نەدات .
: **لەبەر خۆیەوە : چەند بە ئابڕوون .**
قوربان بە سەیری مەزانە کە هاتووین بولای تۆ .
مرۆڤی زیرەك هەمیشە لە دڵی خەڵکی دایە .
ئێمەش بەهرەو زیرەکی تۆ ئەزانین .
: بەڕێزان ، لە ڕاستی‌دا من باشترین شارەزام لە داربڕین‌دا .
ئۆو قوربان .
زۆر ماندووم ناکات .
بەڵام ئێمە باسی ئەمە ناکەین .
هەر بارەشی بە [ سەدوده ] کەمتر نافرۆشم .
لێت ئەپاڕێمەوە بەس باسی داربڕین بکە .
چاك بزانە لەوە کەمتری نافرۆشم .

ف : قوربان . تێگەیشتین .
س : ئەگەر تێگەیشتی ، چاك بزانە لەو نرخە کەمتری نادەم .
ف : دەستێکی گاڵتەجاری چاکت هەیە .
س : گاڵتەی چی . لەوە کەمتری نافرۆشم .
ف : لێت ئەپاڕێمەوە ، با ئیتر بەس بێ .
س : لەوانەیە بە کەمترت چنگ بکەوێ . بارەدار جۆراو جۆرن ، بەڵام ئەوانەی من ...
ف : باشە ، با واز لەو بابەتە بهێنین .
س : سوێندت بۆ ئەخۆم . بەوە کەمترت نادەمێ .
ف : لە ڕاستی‌دا ...
س : نەخێر . ئەبێ هەر ئەوەندە بدەی . خۆ ئەمدۆزیوەتەوە .
ف : قوربان ، بەڕێزی وەك تۆ چۆن ئەبێ بەم شێوەیە باسی شتی وا بکات .
چۆن ڕێ بەخۆت ئەدەی وا قسەبکەی . بۆچی ئەبێ زاناو شارەزاو دکتۆرێکی بەناوبانگی وەك تۆ زانستو شارەزایی‌یەکەی لە خەڵکی بشارێتەوە .
س : لەبەر خۆیەوە ئەڵێ : کابرایەکی شێتە .
ف : قوربان ، تکایە لە خشتەمان مەبە .
س : مەبەستت چییە ؟
ل : پێویست بەم پێچو پەنایە ناکات . ئێمە هەمووشتێ ئەزانین .
س : چی ئەزانن ؟ چیتان ئەوێ ؟ بە چیم ئەزانن ؟
ف : تۆمان ئەوێ . ئەزانین چ دکتۆرێکی بەناوبانگی .
ل : لە هەموو ژیانم‌دا کەسم نەدیوە هێندەی ئەم دکتۆر
س : خۆت دکتۆری . دکتۆر نیم و هەرگیز ناشبم .
ف : **لەبەرخۆیەوە : لێی هات. (ڕوو ئەکاتە سگاناریل): قوربان تکایە . نکۆڵی لێ‌مەکە . خۆت مەشارەوە . با کوتەکی تیا بەکارنەهێنین .**
س : بۆچی ؟
ف : با شتێ ئەکەین ، لێی پەشیمان ببینەوە .
س : چی ئەکەی بیکە . بەڵام من دکتۆر نیم . تۆ باسی چی ئەکەی ؟
ف : لەبەر خۆیەوە : ناچارمان ئەکا ، دەستپێبکەین . [ بە سگاناریل ئەڵێ ] : قوربان ئەم جارەش لێت ئەپاڕێمەوە . خۆت مەشارەوە . دان بەڕاستی خۆت‌دا بنێ .
ل : لە هەموو ژیانم‌دا کەسم نەدیوە هێندەی ئەم دکتۆر بێ‌و لە دکتۆر بچێ .
س : **لەبەرخۆیەوە : پەستم ئەکەن .**

بۆچی دان بەوەدا نانێ کە ئێمە ئەیزانین ؟
ئەم هەموو ســـــەر ڕەقی‌یەی بۆچی‌یە . ئەیەوێ چی‌بکەین .
بەڕێزان قســە هەزارەو یەکی بەکارە ، من دکتۆر نیم ؟
ئەڵێی دکتۆر نیت ؟
نە خێر .
دکتۆر نیت .
پێم ووتن نەخێر .
کە حەزی لێ‌یەتی ناچارین دەســــــت‌پێ‌بکەین .
( سەرو تێلا هەڵ‌ئەگرن‌و لێ‌ی ئەدەن ) .
ئۆو ئای ئۆو . بەڕێزان . چیتان ئەوێ من ئەوەم ؟
قوربان بۆ ناچارمان ئەکەی کوتەك بەکاربێنین ؟
قوربان ، ئێمەش حەزناکەین دارکاریت بکەین .
قوربان هەر باوەڕم نە ئەکرد دکتۆر نەبی .
قوربان داوای لیبوردنت لێ‌ئەکەم .
ئەوە ئێوە ئەڵێن چی . گاڵتەم لەگەڵ ئەکەن ، یان ئاگاتان لە خۆتان نی‌یە بە من ئەڵێن ــ دکتۆر ــ ؟
چی ، پەشیمان بوویتەوە ؟
خوا بم‌کوژێ ئەگەر دکتۆر بم .
تۆ دکتۆر نەبی کێ دکتۆرە ؟
نەخێر . سندانم لێدا ئەگەر دکتۆر بم .
ــ ئەکەونەوە لێدانی ــ ئۆو ئای ئۆو . باشە بەڕێزان من قابل بووم ، چیتان ئەوێ ئەوەم ، من دکتۆرم . ئەگەر حەزیش ئەکــەن ــ دەرمانساز ــ یشم بــەڵام لێم مەدەن .
ئاهـ ، سوپاس بۆخوا ، هاتیتەوە هۆش خۆت .
تۆ ئەم قسە خۆشانە بکە .
ڕاست ئەکا قســەی وا خۆش‌و ڕێك‌وپێك بکە .
بمان بەخشە وا لەگەڵتا جوڵاینەوە .
لەبەرخۆیەوە : تۆ بڵێی بووبم بــە دکتۆرو بەخۆم نەزانیبێ .
قوربان خۆ پەشـــیمان نابیتەوە . بەخوا دکتۆری هەر لە خۆت دێ .
بەڵام بەڕێزان ، ئایا ئێوە دڵنیان کە من ....
ئەی چۆن تۆ بڵێی ؟
جێ‌ی پێخۆشحالیمە .
گومانی ناوێ .
خوا بم‌کوژێ گەر زانیبێتم کە بووم بە دکتۆر .
تۆ زیرەکترین دکتۆری سەرزەوی .
هــا هــا هــا .
نازانم چەند نەخۆشت چاك کردۆتەوە .

س : چاکە ، چاکە .

ف : پێش شــەش مانگ ، ژنێ مرد . پاش شــەش کاژێر یان زیاتــر خەریك بوون بینێژن ، بــەڵام تۆ چاکت کردەوە . هــەر کــە دڵوپی دەرمــانت کردە ناودەمی زیندوو بۆوە ، هەستایە سەرپێ‌وکەوتــە هات‌وچۆ .

س : سندان لێم‌دا گەر من بووبم .

ل : کوڕێکی دوانزە ساڵان لەسەر بانی کڵێســەوە کەوتە خوارەوە . سەرو دەست‌و قاچی وردو خاش بوو ، جۆرە مەلحەمێکت بۆ بەکارهێنا ، نازانم چی‌بوو . ئیتر هەستایە سەرپێ‌وکەوتە یاری‌کردن .

س : مەگەر شەیتان بووبێ .

ف : قوربــان ، ئەگــەر لەگــەڵمانــا بێیت ، چیت‌بوێ دەستت ئەکەوێ .

س : چیم بوێ دەستم ئەکەوێ ؟

ف : بەڵێ .

س : ئۆو ، هیچ گومــانی ناوێ ، من دکتۆرم . لەبیرم چووبووەوە ، وا هاتەوە بیرم . نە خۆشی‌یەکەتــان چی‌یە ، ئەتانەوێ بچیر بۆکوێ .

ف : لەگەڵمانــا وەرە ، نــە خۆشــەکە خاتونێکە زمــانی لەگۆکەوتووە .

س : باوەڕ ناکەم ، هیچم پێ ناکرێ .

ف : کەوتەوە گاڵتەکردن . ( ڕووئەکاتە ســـــگانارێل ) قوربان فەرموو بابڕۆین .

س : بەبێ جل‌وبەرگی دکتۆری .

ف : بۆت پەیدا ئەکەین .

س : [ شــوشــەکە ئەدات بــە ڤالێری ] ، بۆم بگرە . [ ڕوو ئەکاتە لۆکاس ، تف ئەکاتە سەرزەوی‌یەکە ] بە فەرمانی دکتۆر قاچی بخە سەر .

ل : بەسەرچاو قوربان .



**جاکلین‌و ڤالێری ، لۆکاس ، جیرۆنت**

**ڤالێری : بەڵێ قوربان بە دڵی تۆیە . گەورە ترین دکتۆری سەرزەویمان بۆ هێناوی .**

لۆکاس : ئای چەند مەزنە . هەموو دکتۆرەکانی تر پێڵاوی بۆ پا ئەکەنەوە .

ف : کابرایەکە شتی وا ئــەکــات ، بــەخــەوی مرۆڤدا نایەت .

مردوو زيندو ئەكاتەوە ، هەر مەپرسە .
: **زۆر بێ فيزە ، شتی وای لە دەست نەوە شێتەوە لە هيچ كەسێكی نابينی .**
ئای قوربان ، خەڵكی ئەڵێن ، لێم ببورە خەڵكی ئەڵێن جار جارە خۆی بە پياوێكی گێلو نەزان ئەنوێنێ .
**بەڵام لە ڕاستیدا ، زاناو بليمەتی وەك خۆی نی‌یە ، ئەوەی ئەيلێ نايلێتەوە .**
كە قسە ئەكات ، ئەڵێی كتێبەو ئەكرێتەوە .
**ناژبانگی بە هەموولايەك دا بلاوبۆتەوە ، خەلكی پۆل پۆل دێن بۆ لای .**
ت : خەريكم سوێم ئەبێتەوە ، بيهێننە ژوورەوە .
**من ئەچم بيدۆزمەوە ــ ئەچێتەدەرەوە .**
: قوربان من ئەڵێم ، ئەميش وەك ئەوانی تر ئەبێ . هەمان قەوان لێ ئەياتەوە باشترين دەرمان ئەوەيە بيدەی بەگەنجێك كە خۆی دڵی پێوەبێ .
ت[ج] : ئێستا دايەنە نازيزەكە ، بۆلێمان تێك ئەدەی .
زمان درێژی بۆ ئەكەی ، ئافرەت ئەمەكاری نی‌یە تۆخۆتی لێ هەڵقورتێنی .
[جا] : قسەی تيا ئەكەمو ئەيلێمو ئەيلێمەوە ، دكتۆرەكان چارەی خاتوونيان پێناكرێ . پێويستی بە ــ ڕێواسو ڕازيانە ــ نی‌بە ، شوويەكی چاك باشترين دەرمانی دەردی كچانە .
من ئەمەوێ بەشووی بدەم . بەڵام بەربەرچم ئەداتەوە .
وايە تۆ ئەتەوێ بيدەی بەيەكێ خۆشی ناوێ . بۆچی نايدەی بە [ لياندر ] كە يەكتريان خۆش ئەوێ . بەوپەری سوپاسمەندی‌يەوە دێتەخواز بێنیو خاتونيش چاك ئەبێتەوە .
كابرايەكی باش نی‌يە . وەكو ئەوی‌تر دەولەمەندنی‌یە. مامێكی دەولەمەندی هەيەو لەمی زياترنی‌يە .
ئەگەر بەتەمای مامی بێ ، ئەبێ بێ شێو سەربنێتەوە چۆلەكەيەكی ناودەست لە دەچۆلەكەی سەر چڵ باشترە . كار خەلكی دەولەمەند ئەكا . لە هەموو هەورێ باران نابارێ تا مامی وا بە زوويی بمرێو سامانەكەی بۆ ئەم بمێنێتەوە .
پياوی باش لە سامانو پارە باشترە . بەڵام دايكو باوكان ڕاهاتوون هەرئەپرسن : ( كوڕەكە چەند پارەی هەيە ) ، ( كچەكە چەند ميراتی بەرئەكەوێ ).

( گافەر )ی پيرەمێرد [ سيمۆنتا ]ی كچی‌دا بە [ تۆماس ]ە قەڵەوونەيدا بە ( ڕۆبين ) كە لەگەڵ
كچەكەی‌دا دڵيان پێكەوەبوو ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی چەند ياردەيەك ڕەزی لە ( ڕۆبين ) زياتر هەبوو .
ئێستا ــ سيمۆنتا ــ ببينە وەك قاميشی لێهاتووە . ڕەنگی وەكو زەردە چەوەزەرد بووە . قوربان سەيری ئەمە بكە . مرۆڤ يەكجار لە ژياندا دڵی گيرۆدە ئەبێ . من كچەكەم ئەدەم بە يەكێ خۆشی بوێو نايدەم بە هەموو گەنجی چين .
ج : سندانت لێدا . چۆن وا ئەبێ ◆گەروا بكەيت شيری خۆت پێ ڕەوا نابێ .
ل : بەشانی جاكلين‌دا ئەدات : ئافرەت ، زمانت بگرە ، چەند ژنێكی زمان درێژی . ئاغامان زۆرباش ئەزانی چی ئەكاو پێويستی بەو زمان درێژی‌يە نی‌يە . ئاگات لە بەخێوكردنی شيرە خۆرەكەت بێو مەبە بەكەوچك لەم كارانەدا . ئەم باوكی خاتوونەو لە هەموو كەس باشتر ئەزانێ سوودو خۆشی كچەكەی لە چی‌دايە .
ج : ئەوە قسەيە .
ل : قوربان تەنيا ئەمەوی ، جێی خۆی بزانێو ڕێزی گەورەی بزانێو هێندەی بەڕەی خۆی پێی لێ ڕاكێشێ .
ج : بەڵام با نەگاتە لێدانو تێ سرەواندن .

**« ڤالێریو سگاناريل دێنە ژوورەوە »**

ل : قوربان تەنيا ئەمەوێ ، جێی خۆی بزانێو ڕێزی
ج : قوربان زۆر شادومانم بەوەی هاتی . زۆر پێويستمان بەيارمەتيت هەيە .
س : جلوبەرگی دكتۆری لەبەردايەو شەبقەيەكی قوتی لەسەردايە : هايدۆكرات ووتوويەتی :
پێويست ناكات شەبقەكانماندا بكەنين .
ج : هايپۆكرات وای ووتووە .
س : بەڵێ .
ج : تكايە لەچ كتێبێكی‌دا .
س : ئەو كتێبەی باسی ــ شەبقە ــ ئەكات .
ج : ئەگەر هايپۆكرات وای ووتبێ ، ئەبێ وا بكەين .
س : نازيزەكەم دكتۆر : ئاگات لەو كاروفەر تەنەيەيە .
ج : مەبەستت كێ‌يە ؟
س : تۆ
ج : بەڵام من دكتۆر نيم .
س : تۆ دكتۆر نيت .

نە خێر
تێلا یەکی لێ‌هەلئەگری : ناچارم مەکە ( دەست ئەکات بە لێدانی ، هەرچۆن لێ‌یاندا ) .
تکایە ، ئۆو ئۆو ئۆو
ئێستا ئەلێ‌ی چی ، بەردەوام بم ؟
ئەمە چ شەیتانێکە هێناوتانە ؟
قوربان پێم وتی دکتۆرێکی گالتەچی‌یە .
سندانم دا لە خۆی‌و گالتەکەی .
قوربان دڵ نیگەران مەبە ، گالتە ئەکات .
حەز بەم جۆرە گالتەیە ناکەم .
قوربان ، لێم ببورە وا لەگەڵتا جولامەوە .
گوێ‌ی مەدەرێ .
لێم ببورە .
هیچ نی‌یە .
باسی دارکاری‌یەکە ئەکەم .
ئازارم پێ نەگەیشتووە .
بەوپەڕی پێخۆشبوونەوە دارکاریت ئەکەم .
با ئیتر باسی نەکەین . کچەکەم تووشی دەردێکی قورس هاتووە .
قوربان : دلشادم کە کچەکەت پێویستی بە منە .
لە قولایی دلمەوە حەز ئەکەم تۆو هەموو خێزانەکەت پێویستان پێم بێ . هەمیشە لە خزمەت کردنتان دام .
سوپاسی هەستی بەرزت ئەکەم .
دلنیا بە زۆر بە ڕاستمە .
منیش زۆر سوپاس مەندم .
کچەکەت ناوی چی‌یە ؟
لۆسیند .
چەند ناوێکی خۆشـــــە بۆ نەخۆش ، لۆسیند ، لۆسیند .
ئەڕۆم بزانم چی‌ئەکات ؟
ئەو خانمە ناسکە کێ‌یە ؟
دایەنی منالە بچوکەکەمە .
ئەلێم پارچە یەکی نایابە ، ئۆو دایەنەکـە ، چەنـد دایەنێکی ڕووگەشی . هەموو دەرمان‌و شارەزاییم لە خزمەت‌دایە . زۆر بەختەوەر ئەبووم ســـــاوایەك بووماپەو ـ دەست ئەخاتە سەرسنگی ـ تۆ دایەنم بوویتایەو شیرت بدامایەتی . هەموو شارەزایی‌و زانست‌و توانایەکم لە خزمەت‌دایە .
چ گایەکی . ئاغای دکتۆر تکایە واز لە ژنەکەم بێنە .
چی ! ژنی تۆیە ؟!

ل : ئـــای .

س : وا دەرئەخات باوەش بۆ ـ لۆکاس ـ ئەکـاتـەوە . بەلام دایەنەکە ئەگرێتە باوەش : بە ڕاستی من لەمە تێناگەم . زۆر شـــــادمانم . هەردووکتانم زۆر لا ئازیزە .

ل : ڕای ئەکێشێتە لاوە : گوێ‌ی مەدەرێ .

س : دلنیابە زۆر بەختـە وەرم بـەژن‌و مێردایەتیتان . پیرۆزبایی ئەو ئەکەم کـە مێردی وەك تۆی هەیە ـ دووبارە باوەش بۆ لۆکـاس ئەکـاتەوە ، لـە ژێـر شانی‌یەوە خۆی دەرباز ئەکاو خۆی ئەخات بەسـەر ژنەکا ـ پیرۆزبایی لە تۆش ئەکەم کە مێردێکی وات هەیە . چەندە ژنێکی هەستیارو شۆخ‌و شەنگی .

ل : دووبارە دووری ئەخـاتـەوە : تکایە ، ئەو هەموو بەپەرۆشی‌یەی ناوێ .

س : بۆ ناتەوێ پێخۆشبوونی خۆمتان بۆ دەرببڕم .

ل : چی ئەکەی لەگەل منا بیکە ، بەلام ژنەکەم نا .

س : من دلم بە هەردووکتان خۆشە ( هەمـان هەلس‌و کەوت دووبارە ئەکاتەوە ) . ئەگەر لەخۆشیا تۆ لـە باوەش ئەگرم . هەر لەبەر ئەوەشە ژنەکەت لە ئامێز ئەگرم .

ل : دووبارە دووری ئەخاتەوە : ئاغـای دکتۆر ئەوەچی ئەکەی ؟

## جیرۆنت دێتە ژوورەوە :

ج : هەر ئێستا کچەکەم دێنن .

س : قوربان ، بە هەموو پزیشکایەتیمەوە چـاوەڕوانی ئەکەم .

ج : کوان ، لەکوێن ؟

س : دەست ئەبات بۆ ناوچەوانی ـ لێرەدایە .

ج : ڕاست ئەکەی .

س : ئەیەوێ دەسبازی لەگەل دایەنەکـە بکات : لەبـەر ئەوەی دکتۆری خێزانەکەتم . ئەبێ سنگ‌و شیری دایەنەکە تاقی‌بکەمەوە .

ل : ڕای ئەکێشێ‌و خولێکی پێ‌ئەدات : نا ، نا ، نایەلم .

س : ئەمە کاری دکتۆرە کەســـنگی هەموو دایـەنێـك بپشکنێ .

ل : کاری تۆیە ، هی تۆ نی‌یە ، نایەلم .

س : سەر پێچی لە فەرمانی دکتۆر ئەکەی ؟ ، بۆدەرەوە .

ل : گرنگ نی‌یە .

س : بە تیلەی چاوســـــەیری ئەکات : تووشی تاداریت ئەکەم .

جا : لۆکاس ڕائەکێشــــێتە لاوە ، کـــە بەری ئەدات

نەخولێتـەوە : دوور کـە وەرەوە ، ئەتوانم خـۆم بپارێزم .

: نایەڵم دەستت بۆ بەرێ .

: وای چەندە دڵپیس‌و خانە گومانی .

: ئەمە کچەکە مە .

**« لوسیند دێتە ژوورەوە »**

: ئەمە نەخۆشەکەیە ؟

: بەڵێ ، کچە تاقانەکە مە . شتێکی لێ بێ ئەمرم .

: نا بێ هیچی لێ بێ . نـا بێ بمرێ تـا دکتۆر ڕێی ئەدات .

: وەرە سەر ئەم کورسی‌یە .

: نە خۆشێکی خراپ نی‌یە ، پێویستی بـە پیـاوێکی لەش ساغ‌و بە هێزە .

: قوربان ، کەوتە پێکەنین .

: زۆر باشە ، ئەمە نیشـانەیەکی چاکە ، کـە دکتۆر نەخۆش بخاتە پێکەنین . ئێستا بڵێ نەخۆشی‌یەکەت چی‌یە ، چیتە ؟ ، کەی هەسـت بـە خراپ بوون ئەکەی ؟ .

ند [لو] : پەنجە ئەبات بۆ دەم‌و سـەرو چەناگەی : هاو هی هوها .

: ئێهـ . چی ئەڵێ‌ی ؟

: وەکو پێشو بڵە بڵێك ئەکات : هـاو هی هـاو هاو هی هو .

: چی ؟

: هاو هی هو .

: لاسایی ئەکاتەوە : هاو هی هو ها : لێت تێ ناگەم ، ئەمە چ زمانێکی جنۆکەیی‌یە ؟ .

: قوربان ئەمە نەخۆشی‌یەکەیەتی . توانای قـسەکردنی نەماوە . کەس نازانێ بۆچی ؟ . ئەمەش بۆتە هۆی دوا خـستنی شووکردنەکەی .

: بەڵام بۆچی ؟

: ئەو پیاوەی ئەیدەبنێ . ئەیەوێ چاوەڕێ بکات تا چاك ئەبێتەوە .

: ئەو گەوجە کێ‌یە کـە نایەوێ ژنەکەی لاڵ بێ ؟ . خوایە بۆ ژنەکەی من وا لێ‌ناکەی ، هـەرگیز نـەم ئەویست چاك بێتەوە .

قـوربـان هـەرچـۆنێ بێ . لێت ئـەپـاڕێمەوە چیت لە دەست دێ بیکە تا کچەکەم چاك بکەیتەوە .

: ئۆو خۆت مەشێوێنە . پێم بڵێ هیچ ئازاری هەیە ؟

: بەڵێ قوربان .

: باشە . ئازاری زۆرە ؟

: زۆر زۆر .

س : ئەچێتە سـەر هێن . خۆت ئەزانی کوێ ئەڵێم ؟

ج : بەڵێ .

س : زوو زوو ؟

ج : نازانم .

س : هێنەکەی ئاسایی‌یە ؟

ج : نازانم .

س : ڕوو ئەکاتەوە نەخۆشەکە : دەستم بدەرێ . لێدانی دڵی وا ئەگەیەنێ کچەکەت ( لاڵ ) بووە .

ج : ئۆو بەڵێ قوربان . دۆزیتەوە ، خۆیەتی .

س : هـا هـا

جا : سـەیرکەن ، نەخۆشی‌یەکەی دۆزی‌یەوە .

س : ئێمەی گەورە دکتۆران . ئەم شتانە لـە یـەکـەم سەیرکردنەوە ئەزانین . بەڵام نەشـــارەزاکان بیرئەکەنەوەو ئەڵێن [ یان ئەمەیـە یان ئەوەیـە ] . بەڵام من یەکسـەر پەنجە ئەخەمە سەر نەخۆشی‌یەکە و ئەمەوێ پێت بڵێم کە کچەکەت لاڵ بووە .

ج : بەڵێ ، بـەڵام زۆر حـەزئەکەم پێم بڵێ‌ی چۆن لاڵ بووە ؟

س : زۆر ئاسـانە ، لەبەر ئەوەی توانای قـسـەکردنی نەماوە .

ج : باشـە ، بەڵام بۆچی ـ توانای قـسەکردنی نەماوە ..

س : هەموو گەورە زانایان ئەڵێن ، لەبەر ئەوەیە کـە زمانی بەباشی بۆ نا جوڵێ .

ج : بەڵێ ، بەڵام بۆ ناتوانێ ، بە باشی زمانی بجوڵێنێ ؟

س : ئەرەستۆ شتێکی سەیر ئەڵێ لەم بارەیەوە .

ج : باوەڕم پێ‌ی هەیە .

س : پیاوێکی مەزن بوو .

ج : گومانی ناوێ .

س : پیاوێکی ئێجگار مەزن‌بوو . لـە من مەزن تر بوو ، دەستی لە ئانیشکەوە بەرزئەکاتەوە بـا بگەڕێینەوە سـەر قـسەکەی خۆمان : من ئەڵێم نـاتوانێ زمـانی بە باشی بەکاربێنێ . هۆکەی جۆرە شلەیەکە ئێمەی دکتۆر ناومان ناوە ـ ناساغی ، ناسـاغی ـ ئەتوانی بڵێ‌ی شلەی ناساغی ـ . بەم جۆرە ئـەو هەڵمەی لە هەست‌و سۆزەوە بەرز ئەبێتەوە ، لە شـوێنە نە خۆشەکەوە . قـســەی خۆمـان بێ ( لاتینی ) ئەزانی .

ج : زۆرنـا

س : بە شانازی‌یەوە خۆی بـەرز ئەکاتـەوەو سـنگ دەرئەبەڕێنێ : لاتینی نازانی ؟

ج : نە خێر

دەست ئەکات بە قسەی سەیر سەیر : کاپریکۆس
نارکی سورام ، کاتالا مەس ، سینکو لاریشەر ،
نو فیا تیڤۆ ، بەك موسا ، موسەکەش ، بۆنەس ،
بۆنا ، بۆنەم ، دیوس ، سانکتەس ، ئیست ،
نی ئۆراپتۆلاتینەس ؟ ئیتیام ، بەڵێ ، کوار بۆچی ؟
کویا ، سەبستانتیڤۆ ، ئیت ، ئەدجیکتیڤەم ،
کونکوردەت ئین جینێری ، نۆ میرەم ئیت کاسەس .
ئۆو خۆزگە قوتابی ئەبووم .
پیاوی زیرەك وا ئەبێ .
ئای زۆر بلیمەتە ، یەك ووشە تێنەگەیشتم .
ئەم هەڵێنە بە جگەر ـ لەلای چەپ ـ و دڵ لە لای
ـ ڕاست ـ دا ئەڕۆن .

سیەکانیش کە بە لاتینی پێی ئەڵێین ـ نارمیان ـ.
بە هۆی خوێنبەرێکی بۆشەوە کە بە عیبری پێی
ئەڵێن ـ کۆبیل ـ پەیوەندی هەیە بە مێشکەوەکە
بەلاتینی پێی ئەڵێن ـ ناسمەس ـ . بەم جۆرە
زگۆلەکان پڕ ئەکەنەوە . ئەم هەڵمە باش گوێ بگرە
کاریگەریەکی خراپی هەیە ، تکایە باش گوێ بگرە .
بەڵێ
کاریگەریەکی خراپی هەیە . تکایە ئاگات لە
قسەکانم بێ .
ئاگادارم
ترشێتی ئەو شلەیەی لە چاڵایی ناو پەنچك دایە ،
ئەم هەڵمانە [ ئۆسابانەس ، نیکیۆس ، نیکۆر ،
پۆتارینەم ، کیۆ پامیلەس ] . ئەمە کچەکە تی لاڵ
کردووە .
ئۆو پیاوەکە قسەکانی گەوهەرن .
زەنگۆڵەیە .
هەمووی ڕوونو ئاشکرابوو . بەڵام تەنیا سەرم
لەیەك شت ئەسوڕمێ . من بزانم هەڵەیەکت کرد .
دڵ لای چەپەو جگەر لای ڕاستە .
بەڵێ جاران وابوو ، بەڵام ئێمەی دکتۆر هەموو
شتێکمان گۆڕی . دڵمان خستە لای ڕاستو
جگەرمان خستە لای چەپ .
ببوورە ئاگام لەم پێشکەوتنە نیە .
گوێی مەدەرێ ، ئەزانم هەموو شتێ نازانی .
بێ گومان ، بەڵام قوربان چی بکەین بۆ نەخۆشی
کچەکەم ؟
چی بکەین ؟

بەڵێ .
ئەڵێم با بچێتەوە ناو جێگەکەیو هەندێ تریتی

نانو شەرابی بدەنێ .
ج : ئەمە بۆ چی ؟
س : لەبەر ئەوەی تریتی نانو شەراب توانایەکی تایبەتی هەیە بۆ زمان گرتن . خۆت ئەزانی ، ئەم تریتە ئەدەن بە تووتی تا زمان بگرێ .
ج : ڕاستە ، چەند پیاوێکی بلیمەتە ، خێراکەن تریتەکە دروستکەن .
س : ئێوارە سەری لێ ئەدەمەوە بزانم چۆنە ؟
ڕوو ئەکاتە دایەنەکە : کەمێ ڕاوەستە بە جیرۆنت ئەڵێ : قوربان کەمێ دایەنەکە ئەپشکنم .
جا : من ، من هیچم نیە .
س : بەداخەوە ، دایەنەکە بەداخەوە . گەر نەخۆش بوویتایە پەیوەندیمان بە هێز ئەبوو . هیچ ئازارت پێ ناگات . شرینقەیەکی جوانکە لەت لێبدەم . ئەمەش ڕێیەکی تەندروستیە . هەرچۆن ئاو ئەخۆینەوە تا تینوومان نەبێ . هەروەها ئەبێ دەرمانیش وەرگری تا نە خۆش نەکەوی .
جا : دوور ئەکەوێتەوە : پێویستم بەدەرمانو مەرمان نیە ، زۆر لەشم ساغە .
س : نە خۆشێکی بێ مێشکی . بەڵام ئەت هێنمەوە هۆش خۆت . ڕوو ئەکاتە جیرۆنت : قوربان بە یارمەتی خۆت .
ج : تکایە مەڕۆ .
س : جێت ئەوێ .
ج : قوربان ، بەخشیشەکەت .
س : دەستی لە ژێر جلەکانیەوە درێژ ئەکات ، جیرۆنت ـ جزدانەکەی ئەکاتەوە : قوربان نامەوێ ، وەری ناگرم .
ج : قوربان .
س : نە خێر .
ج : کەمێ ڕاوەستە .
س : نا ، نا ، نا .
ج : تکایە .
س : گاڵتە ئەکەی .
ج : وەرە ، دەستت بگرە .
س : نە خێر ، ناتوانم .
ج : نێ ی ؟ .
س : من ئیش بۆ پارە ناکەم ..
ج : تێ ئەگەم .
س : وەری ئەگرێو دەستی لێ ئەخات : ساختە نیە ؟
ج : نە خێر .
س : من کابرایەکم بۆ پارە ئیش ناکەم .

: دلنیام .

: ماندووت کردم .

: لام وایە ــ ئەچێتەدەرەوە .

: سەیری پارەکە ئەکات : لێماندا ، شتێکی باشە ئەگەر .....

**« لیاندر دێتە ژوورەوە »**

[لی] : قوربان . لە ڕووەوە چاوەڕێتم . هاتووم یارمەتیم بدەی .

: مەچەکی ئەگرێ : دلت باش لێ نادات .

: قوربان من نەخۆش نیم ، بۆ ئەوە نەهاتووم .

: نە خۆش نی ، بۆچی وا ئەڵێی .

: نە خێر . بەکورتی ناوم ــ لیاندر ــ ە . منو ئەو کچە نە خۆشە دلمان بە یەکەوەیە . باوکە پیسکەکەی ڕێی یەك بینینی لێ قەدەغە کردوین . ئیتر هاتووم بۆ لای بەڕێزتان یارمەتیم بدەی . هەموو ژیانو بەختیاریم لەسەر ئەوە بەندە ببینیمو چەند قسەیەکی لەگەلا بکەم .

: خۆی بە پەست دەرئەخات : چیت لە من ئەوێ . مرۆڤێکی هاتووی بمکەی بە دەلالی خۆشەویستی‌یەکەت و پیرۆزی پیشەی پزیشکایەتی لەکەدار بکەی .

: قوربان دەنگ بەرز مەکەرەوە .

: لە خۆی دوورئەخاتەوە : ئەیکەم . نایکەم ئارەزووی خۆمە . تۆ چەپەلی .

: قوربان ، ئالۆزی مەکە .

: دەست کورتو دەروون نەخۆشی .

: تکایە .

: فێرت ئەکەم من ئەو جۆرە پیاوانە نیم ، ئەوپەڕی دەبەنگی‌یە ...

: جزدانەکەی دەرئەهێنیو بۆی ڕائەگرێو ئەڵێ : قوربان .

: جزدانەکەی لێ وەرئەگرێو هەڵی ئەگرێ : من بەگری بگری . من باسی تۆ ناکەم . تۆ کوڕێکی زۆرچاکی . زۆر دلشادم یاریدەی بەڕێزتان بدەم . بەلام چەند کەسێکی چەپەڵ هەن ، باسی ئەوان ئەکەم . بە ڕاستی پەستیان کردبووم .

: لێت ئەپاڕێمەوە ، بەڵێنم بدەرێ یارمەتیم ئەدەیت .

: چیت بۆ بکەم ؟

: ئەو نە خۆشی‌یەی لوسیند بە هیچ دکتۆری چار ناکرێ . هەندێکیان ئەڵێن هۆکەی لە مێشك یان هەناو دایە ، هەندێکی تر بە جگەروسپلی ئەزانن . بەلام لە ڕاستی‌دا هۆکەی ــ ئەوین ــ ە . لوسیند وای لە خۆی کردووە تا بە زۆر نەیدەن بەو کابرایەی خۆشی ناوێ . با لێرە لاچین نە وەك خەلکی بێکەوەمان بینی . ئەڕۆین پێشت ئەڵێم چیم ئەوێو چی بکەین ؟

س : دەی بڕۆین ، قوربان زۆر بە پەرۆشم یارمەتیت بدەم یان ئەبێ بۆ تۆ بێ یان من دکتۆر نیم .

## بەردەی سێهەم

**« لیاندر ، سگاناریل »**

لی : **بەدەرمانساز ئەچم . باوکی زۆری نەدیوم . ئەگەر جلو بەرگەکەم بگۆڕمو قژێکی تر لەسەر بکەم نامناسێتەوە .**

س : گومانی ناوێ .

لی : چەند وشەیەکی دکتۆریم فێرکە ... تا قسەکانی بێ قەلەو بکەمو خۆم بە پیاوێکی زاناو شارەزا دەربخەم .

س : نۆو نا . ئەمە پێویست ناکات ، جلەکان بەسە ، منیش هێندەی تۆی لێ ئەزانم .

لی : **چی ؟**

س : خوا بمکوژێ گەر هیچ لە دکتۆری بزانم . تۆ گەنجێکی باشیو دلت بۆ من کردەوە . منیش ئەمەوێ دلت بۆ بکەمەوەو ڕاستیت پێ بلێم .

لی : **چی ، بەڕاستی تۆ ...**

س : نە خێر ، بە زۆرکردمیان بە دکتۆر . هەرگیز ئەوەندە زانستم نەبووە بەوە ببم . هەر لەسەرەتایی‌یەوە وازم لە خوێندن هێناوە . نازانم چۆن ئەمەیان بەبیردا هات . کە سەیرم کرد ئەیانەوێ بە زۆر ببم . بڕیارمدا ببمو چی ئەبێ با ببێ . خۆشی‌یەکەی لەوەدایە هەموویان بە زیرەكو بلیمەتم ئەزانن ، لە هەمولایەکەوە دێن بۆ لام . گەروابڕوا ئەبم بە دکتۆر . شتێکی باش بکەیت یان نەیکەیت هەر پارەی خۆت وەرئەگری . ئەگەر

بینە چی‌یەك پێلاوی خراپ بکات پێی ئەبژێرن ، بەلام ئەگەر ئێمە مرۆڤێکیش بکوژین ، سەرزەنشت ناکرێین .

لی : **بەلێ لەم بارەیەوە پیاوی چاکن .**

س : خەلکی بینی بەرەوڕوویان هاتن : وا دیارە دێن بۆلای من ــ بە لیاندر ئەلێ : بڕۆ لە نزیك مالیانەوە

چاوەڕێم بکە ـ لیاندر ئەڕوا .

**« تیبۆو کوڕەکەی دێنە سەرەوە »**

قوربان ، هاتوین بۆلای بەڕێزتان .
چیتان ئەوێ ؟
دایکە پیرەکەی ، ئەوە شەش مانگە نە خۆشەو لە جێدا کەوتورە .
دەستی بۆ پارە ڕائەگرێ : چی بۆ بکەم ؟
دەرمانێکمان بەرێ چاکی بکاتەوە .
ئەبێ بزانم چییەتی ؟
قوربان نەخۆشی دووڕوویی گرتووە .
دوو ڕوویی .
نا ، هەموو گیانی ئاوساوە ، ووتیان تووشی شتێکی ترسناك بوو ، جگەرو سكوسپڵی لە جیاتی خوێن ئاو دروستئەکات . زۆر جار تووشی تاداری ئەبێ ماسولکەکانی کۆڵنج ئەکەنو ئەیەشن . جار جارە خەریکە بخنکێ . لە خۆی ئەچێو گەشکە ئەکات . دەرمانسازێك لە گوندەکەماندایە ، هەمووکەس ڕێزی ئەگرێ ، زۆر دەرمانیدایە بەڵام سودی نەبوو . ویستی جۆرە دەرمانێکی بداتێ پێی ئەڵێن شەرابی « ئەمیتیل » . بەڵام ترسام بیکوژێ .
هێشتا دەستی بۆ پارە ڕاگرتووە ، بە جۆری ئەیجولێنی دەری بخات داوای پارە ئەکات : باسی مانگا سور بکە کابرا باسی مانگا سور بکە .
قوربان هاتین پێمان بڵێی چی بکەین ؟
نازانم ئەڵێی چی ؟
پ] : جزدانەکەی باوکی دەردێنیو ئەیداتێ : قوربان دایکم نە خۆشە . ئامۆژگاریان کردین بێین بۆلات دەرمانێکمان بدەیتێ بۆ دایکم .
ئۆو ، تێگەیشتم ، چەند زمانت پاراوە . ئەزانی ئەتەوێ بڵێی چی . ئەڵێی دایکت نە خۆشە ، لە هۆش خۆی چووە ، لەشی ئاوساوە . تای هەیە ، قاچی دیشێ ، جارجارە بێ هۆش ئەبێو گەشکە ئەکات واتە ( پەرکەم ) ئەیگرێ .
نا ، قوربان ، بەو جۆرەیە .
یەکسەر لە تۆ ئەگەم . باوکت نازانی ئەڵێ چی ، ئێستا دەرمانت ئەوێ .
بەڵێ قوربان .
شتێ چاکی بکاتەوە .
بەڵێ ئەمەم ئەوێ .
باشە ، ئەم پارچە پەنیرەی بۆ بەرە .
قوربان پەنیر .

س : بەڵێ ، پەنیرێکی تایبەتییە ، ئاڵتونو مەرجانو مرواریو زۆر شتی بە نرخی تری تێکراوە .
پ : قوربان زۆر سوپاس ، ئێستا ئەچین یەکسەر ئەیدەینێ .
س : بڕۆ ئەگەر مردیش ، شینێکی باشی بۆ بگێڕن .

**پێرینو باوکی ئەڕۆن ـ جاکلینو لۆکاس دێنە سەرەوە**

س : ئەمە دایەنە جوانەکەمە ، ئای دایەنی دڵم . چەند دڵشادم بە بینینت . بینینت لە ڕێواسو ڕازیانە باشترە بۆ چارەی ماخۆلانی یەکەم .
جا : دکتۆر ، من لە هەموو قسە لاتینییەکانت تێ ئەگەیشتم .
س : نەخۆش بکەوە ، دایەنەکەم نەخۆش بکەوە ، لێت ئەپارێمەوە لەبەر من نەخۆش بکەوە . تا بە چارە کردنت بەختەوەربم .
جا : قوربان سوپاس ، منیش گەر نەخۆش بوومایە حەزم ئەکرد هەرگیز چاك نەبمەوە .
س : چەندە بەزەییم پیاتا دێتەوە ، دایەنە جوانەکەم مێردێکی وا بەرچاو تەنگو دڵپیست هەیە .
جا : قوربان چی بکەم ، ئەمە سزای گوناهە کانمە .
س : هەمیشە چاوی بە دواتەوەیە . نایەوێ کەس قسەت لەگەڵ بکات .
جا : چیت دیوە . ئەمە نمونەی خەرواریکە .
س : ئەبێ پیاو چۆن دڵ لە تۆ پیس بکات . چەند ئافرەتێکی شۆخو شەنگی کەوتوێتە چنگی کابرایەکی گەوجو بێ سۆزو کێویلە . دایەنەکەم ببوورە وا باسی مێردەکەت ئەکەم .

جا : ئای قوربان ، هەموو خراپییەکانی ئەزانم .
س : بەڵی دایەنەکە هەمووگیانی خراپەیە . پێویستە تۆڵەی ئەو دڵ پیسییەی لێبکەیتەوە .
جا : ڕاستە ، ئەگەر من بیر لە خراپی یەکانی بکەمەوە ، شتی سەیرم لە دەست ئەقەومێ .
س : ئەڵێم پێویستە : لەگەڵ یەکێکیتردا تۆڵەی لێ بکەیتەوە . خۆم بە بەختەوەر ئەزانم من هەڵبژێری .

**[ لەم کاتەدا ئاگایان لە ـ لۆکاس ـ بوو لە پشتیانەوە خۆی مەڵاس دا بوو گوێی لێ ئەگرتن . بەرەولاکەی تر خۆیان دزییەوە ] .**

**« جیرۆنت دێتە سەرەوە »**

ج : سڵاو لۆکاس ، دکتۆرت نەدیوە ؟
ل : نا ، لەگەڵ ژنەکەم دا بوو .

: بۆ کوێ چوو ؟
: نازانم ، حەز بە لەناو چونی ئەکەم .
: بڕۆ بزانە کچەکەم چی ئەکات ؟

**« لۆکاس ئەڕوا ، لیاندرو سگاناریل دێنەوە »**

: ئۆو قوربان ، بەدوای تۆدا ئەگەڕام .
: ـــــەر قـاڵ بووم . خەریکی شـلەیەك بووم لـە باغچەکەدا . نەخۆشـەکەمان چۆنە ؟
: خراپترە ، لەوەتی تریتەکەی خواردووە خراپتربووە.
: ئەمە نیشانەی ئەوەیە ، بەکارە .
: بەڵێ ئەترسم بیخنکێنێ .
: خۆت مەڕەنجێنە ، دەرمانی هەموو دەردێکم لایە . هێشتا زووە .
: دەست بۆ لیاندر ــ ڕائەکێشێ : ئـەم کابرایەکێیە لەگەڵتایە ؟
: وا پیشان ئەدات دەرمان سازە ــ هینە .
: چییە ؟
: تەپلەکەی خوار ئەکاتەوە : ئەو پیاوە .
: ئـا
: کێ ؟ ــ تەپلەکەی زیاتر خوارئەکاتەوە .
: تێگەیشتم .
: کچەکەت پێویستی پێی ئەبێ .

**« جاکلین و لوسیند دێنە ژوورەوە »**

: قوربان . کچەکەت پێویستی بەکەمێ گەڕانە .
: بۆی باشە . ئاغای دەرمانســـــاز . لێدانی دڵی بگرە . من باسی نەخۆشییەکە بۆ باوکی ئـەکـەم ــ جیرۆنت ئەباتەلاوە . دەست ئەخاتە سـەرشانی ، بەدەستەکەی ... ی چەناگەی ئەگرێ تاکو چاوی لەوان نەبێ ــ .
قوربان دکتۆرە شارەزاکان لەســـــەر ئەوە ڕێك نەکەوتوون ئایا ژن زووتر لە پیاو لە نەخۆشی چـاك ئەبێتەوە . هەندێ ئەڵێن بەڵێ . هەندێکی تر ئەڵێن نەخێر . من خۆم ئەڵێم [ بەڵێ . نـە خێر ] . لەش زاڵـە بـە سـەر زیرەکیدا ئـەمەش لەبەر ئـەوەی ئەوشلانە پێکەوە ناگونجێن کە لە سروشت و خودی ژنەوە بەرزئەبێتەوە . حول حولی ئافرەت پەیوەندی بە خولی مانگەوە هەیە ، هەر چۆن خۆرتیشـــــکی بەســــــەر چالی زەویدا بلاو ئەکاتەوە . بۆمـان دەرکەوتکە .....

ند : قسە بۆ لیاندر ئەکات : نە خێر من نەگۆڕاوم .
: ئەمە دەنگی کچەکەمە قسە ئەکات . زۆر سوپاس .

چەنـد دکتۆرێکی مەزنی ، چۆن ئـەم پیـاوەتیـەت بدەمەوە .

س : دێت و ئەچێ و دەســـــت بە برۆکانیدا ئەهێنێ : توش ئەبین .

لو : بەڵێ ، بابە ، ئێســـتا ئەتوانم قســـەبکەم . بەلام بۆ ئەوەی پێت بڵێم شوو بە ــ لیاندر ــ ئەبێ بەکـەسی ناکەم . نابێ بمدەیت بە [ هۆراس ] .

ج : بەلام

لو : پەشیمان نابمەوە

ج : چی ؟

لو : پێویست ناکا زۆرم لێبکەی .

ج : ئەگەر

لو : کەس ناتوانێ بەزۆر بەشووم بداتێ .

ج : من

لو : هەرگیز بەمە قایل نابم .

ج : لێرا

لو : خۆم ئەخەمە دێرەوە ، شووبە کابرایەك ناکــــــەم خۆشم ناوێ

ج : بەلام

لو : بە دەنگێکی نێر : نەخێر ، سودی نییە ، کاتی خۆت بە فیرۆمەدە نایکەم ، ئەمە دوا بڕیارمە .

ج : ئۆو چ دەمی هەراشـــــــە . هیچی لەگەلا ناکرێ ــ بە سگاناریل ئەڵێ ــ قوربان لا لێبکەرەوە .

س : ناتوانم : تەنیا ئەتوانم بیخەمە قسە .

ج : زۆر سوپاس ــ قسە بۆ کچەکەی ئەکات : کەواتە تۆ وا ئەزانی .

لو : نەخێر ، قسـەکانت نامگۆڕن .

ج : ئەم ئێوارەیە لە ــ هۆراس ــ ت مارە ئەکەم .

لو : خۆم ئەکوژم .

س : بە جیرۆنت ئەڵێ : تکایە ڕاوەستە ، با من چارێکی بکەم . هێشتا نەخۆشە ، بەلام ئەزانم چ دەرمانێکی ئەدەمێ .

ج : قوربان ، ئەگەر ئەتوانی ئەم بێ مێشــــــکە چاك بکەرەوە .

س : بەڵێ وازی لێ بێنە بۆ من ، چارەی هەموو شتێکم لایە . ــ بە دەرمانسازەکە ئەڵێ ــ بۆت دەرکـەوت حەزکردنەکەی لە لیاندر ــ لەگەڵ ویستی باوکیدا ناگونجێ . باکات بە فیرۆ نەدەین ، شلەمەنییەکـان ئەگەنن ، ئەبێ زوو چـارەیـەکی بۆ بدۆزینـەوە . هــەنـدێ دەرمـــانی ڕەوانـکەری بـۆ تێـکەڵ بـە ــ مەتریمۆنی ــ بکە . لەوانەیە بۆی ئەخورێ . بەلام

تۆ کاری خۆت ئەزانی ، وای لێ بکە بە ئاســـــانی
قووتی بــدات ، خولێك بــە باغچــەکــە دا بــدەن ،
تا شلەکان لەکەف‌وکوڵ ئەکەون .
منیش قسـە بۆ باوکی ئەکەم . کات بەفیرۆ مەدە .
بەپەلە چارەی بکەو خۆت ئەزانی کە ئەمە تـەنیـــا
چارەیە .

**« لوسیندو لیاندر ئەچنە دەرەوە »**

قوربان ، ئەو دەرمانانــە چی بوون ، من شتی وام
نەبیستووە ؟
تەنیا لە ناچاریدا بەکاردێت .
هەرگیز بێ مێشکی وات دیوە ؟
کچان سەر ڕەقن .
نازانی چەند سورە لەسەر خۆشـــــەویستی ئـەو
ـ لیاندر ـ ە .
خوێنی گەنج گەرمەو قولپ ئەدات .
کە زانیم وا سورە ، لە ماڵەوە بەندم‌کرد .
چاکت‌کرد .
تەنانەت ، یەك بینینم لێ قەدەغەکردون .
بەتەواوی
ئەگەر یەك ببینن لەوانەیە کارێکی کەرانەیـان لـــە
دەست بقەومێ .
گومانی ناوێ .
لەوانەیە ڕاشیان بکردایە .
زۆر لە جێی خۆی دایە .
پێیان ووتم زۆر هەوڵی‌داوە ـ لوسیند ـ ببینێ .
بەگاڵتــە .
کاتی خۆی بەفیرۆ ئەدات .
هـا هـا هـا
نایەڵم چاوی پێی بکەوێ .
تۆلـەو زۆرزانتری . کاری وا نـاکـات کاتی بــە
فیرۆ بچێ .

**« لۆکاس دێتە ژوورەوە »**

قوربان ، فریاکەوە ، لیاندر ـ کچەکەتی هەڵگرت .
ئاغای دکتۆر ئەم پیلانەی ناوەتەوە . لیاندر ـ ی بە
بەرگی دەرمانـــــــازی‌یەوە هێناوە ـ لوســــیند ـ
ببینێ .
ئاوا پاشقولم لێ ئەگری . نەیەڵێ دەرچێ ، ئۆو ناپاك
ئەت‌دەم بەدادگا .
بە دەست من بێ هەر ئێستا لە داری ئەدەم .

**« مارتین دێتە ژوورەوە »**

م : بۆ لۆکاس : زۆرم پێ‌چوو تـا ئێرەم دۆزی‌یـەوە .
پێم بڵێ ئەو دکتۆرە چی لێ هات کە بۆم دۆزینەوە .
ل : ئەوەتانێ ، لە دار ئەدرێ .
م : چی ، مێردەکەم لە دار ئەدرێ ، خوایە چی‌کردووە
تاوای لێ‌بکەن ؟
ل : پیلانی ڕاکردنی کچی ئاغامی ناوەتەوە .
م : مێردە خۆشەویستەکەم ، ڕاستە لە دارت ئەدەن ؟
س : وەك ئەبینی ،
م : لەبەردەم ئەم هەموو خەڵکەدا .
س : چی بکەم ؟
م : خراپ نی‌یە ، خۆ لە دەست دار بڕین ڕزگارت ئەبێ
س : وازم لێ‌بێنە ، دڵم ئازار مەدە .
م : ئەمێنمەوە ، هەڵت ئەنێم بە ئازایی بمری . جێت
ناهێڵم ، تا ئەبینم ئەت دان لەدار .
س : ئۆو

**« جیرۆنت دێتە ژورەوە »**

ج : کار بەدەستان دێن‌و ئەتبەن لێت بپرسنەوە .
س : تەپلەکەی بەدەســــتەوەیە : خوایە بـا بەدارکاری
ڕزگارم بێ .
ج : نە خێر تاوانبار ئەبێ سزای خۆی وەربگرێ .

**« لیاندرو لۆسیندو جاکلین دێنە ژوورەوە »**

لی : قوربان هاتووم خۆمت پێش‌کەش بکەم من لیاندرم .
لوسیندم هێنایەوە . خەریك بوو ڕابکەین‌و زەماوەند
بکەین . ویستمان بە شێوەیەکی جوانتر بێ . مـن
نامەوێ کچەکەت لێ زەوت بکەم . حەز ئەکەم تـۆ
بمدەیتێ . قوربـان هـاتم پێت بڵێم کە نامـەیەکم
پێ‌گەیشتووە ، کە مامم مردووە.هەموو سامانەکەی
بۆ من ماوەتەوە .
ج : قوربـان ، زۆرکـارەکەتم پێ جوانــە . کچەکـەمت
بەوپەری شادمانی‌یەوە ئەدەمێ .
س : لەبەر خۆیەوە : تەڵەیەکی باش‌بوو بۆ دکتۆری .
م : کە لە دار نادرێی سوپاسم بکە کردمیت بە دکتۆر
من بووم بەهۆی بەرزبوونەوەت .
س : نای تۆ بووی بە دارو فەلاقەت دام .
لی : بە سکاناریل ئەڵێ : سوپاس بۆ یارمەتی دانەکەت ،
بەڕاستی کارێکی پیاوانە بوو .
س : هیچ نی‌یە گوێی مەدەرێ ـ بۆ مارتین ـ لـەبـەر
ئەوەی بەرزت کردمەوە لێت نەبوورم . بەڵام لەمەولا
نـەبێ وەك دکتۆرێك ڕێـزم بگـری‌و بزانی تورەیی
دکتۆر چەند ترسناکە .

# تەلیسمی خۆشەویستی

○ ئاسۆ ○

لەم دنیا سنورەدا خۆشەویستی قەوارەی نەتەوەکانی دنیای دروست‌کردووە .

خۆشەویستی‌یە شیرازەی یەکیتی کومەلانی خەلکی پاراستووە . خوشەویستی‌یە خاکو خولی شارو دێ‌و هەموو گونجیکی خۆشی‌یان ناخوشی سەرزەمینی لای مرۆڤ کردووە بە پەرستگا .

خۆشەویستی‌یە بزماری قەفەزی بولبولی خوش ئاوازی ناوکۆیی نێوان خیزانانی دنیای داکوتاوە .

خوشەویستی‌یە بناغەی بابل‌و قەسری شیرین هەلداوەتەوە ، لەلایەکی‌ترەوە هەر خوشەویستی‌یە سنوری نیشتمانانی لە نێوان مرۆڤی سەرزەمیندا خستوتە سەرپشت . هەر ئەویشە ناوبەناو تینی ناکۆکی نەتەوایەتی‌و چینایەتی گز ئەکات .

خوشەویستی‌یە لە پۆلا قایم‌تر لە کیۆ بالاتر لە خەنجەر تیژتر لە دیمەنی جوان دلگیرتر لە مەی بزوێن‌ترە ، رەنگە هەبێ دارایی ، چەک ، جوانی ، پایەداری ، دەسەلاتداری ، ناوداری ، دەست‌رویشتوویی‌یان لا سەنگین‌تر بیت !

بەلام نە ئەمانەو نە هیچ شتیکی‌تر بە گەردی سمی ئەسپی خوشەویستی ناگەن .

مەگەر خوشەویستی خوی ببیت بە فتیلی بزوێنی‌ری ئەمانە ئەگینا خۆیان بە تەنیا پارچە پەتێکی بێ‌گیانن .

هەر خوشەویستی‌یە گیانی هەزاران ملیۆن مرۆڤی خەلات‌کراوە ، هۆشی لە هەزاران ملیۆن مرۆڤ سەندووە ، گیان‌و دارایی‌و ئاسودەیی‌و ئاسایشی بە قوربان کراوە !!

رەنگە لای گەلیک ئەم وتەیە سەرسورمێن بیت . یان دەستکردی تارمایی خەیالی بویژێ یان نوسەرێک بیت‌و بەس بەلام پاسایەکی بناغەی دامەزراوی تیک نەچوویی ژیانی مرۆڤایەتی‌یە .

* * *

گەواتا ئەبێ ئەم هیزە کاریگەرە بێ‌سنورە مەلبەندی کوێ‌بیت ؟!

هەن ئەلین لە دلدایەو هەن ئەلین لە مێشکت‌و هەن ئەلین لە ناخی دەرون . ئنجا ئەبێت بە هۆش‌و ئارەزوو ویست ، ئەمانیش ئەبن بە کردەوە ، کردەوەش ئەبێت بە ماددە . هەندێکیش هەن لە خوارەوە بۆی ئەچن ، تا ئەگەنەوە ئەوسەری . هەر ئەمەشە زانیاران‌و پسپۆرانی کردووە بە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە هەر بە یەکدا دێن‌و ناگەنە یەک ، نەک هەر ئەمە بەلکو پشتیشیان کردۆتە یەکو بە پیچەوانەی یەکتری ئەرون بە ریگاوە .

دەی ئەبێ ئەم هیزە کاریگەرە بێ‌ئامانە لانە نەزانراوە چی‌بیت‌و لە چی پەیدا بوبێت‌و لە چ مەلبەندێکەوە هاتبێتە کایەوە کە هەزاران ملیۆن مرۆڤی خستبێتە سەماو دەیان هەزار زاناو پسپورو فەیلەسوفی بە خۆیەوە خەریک کردبێت ؟!

* * *

چ وەلامیک بدریتەوە ریگا لەو راستی‌یە نابەستێتەوە کە خوشەویستی خاوەنی پایەیەکی بەرزو بوونیکی پێویست‌و بزوێن‌و داهینەرە ، ژیان بەرەوپێش‌و دل بە دنیا خۆشکەرە .

رۆژێکیش هەردێت ئەم فریشتەی خیرە ، ئەم تەلیسمی ژیانە ، ئەم دروست‌کەری ئاوازی دەروونە پەردەی ئەودیوی هەلبدرێتەوە .

بەلام سەبارەت بەمنی بەندبوی شورەی پولایی لە رمان‌نەهاتوی خوشەویستی نەخوم ئەمەویت‌و نە ئەویش ریگام ئەدات سەرەموویەک پێ لە هێلی ئەم شورەیە بترازێنم ، لەگەل ئەوەشدا لەناو ئەم شورەیەدا دل بە دنیا خۆش ، دەرگای کۆشکی ژیانی سەربەرزی‌و پڕ کامەرانی خراوەتە سەرپشت ، خۆمی بەهاوشانی خەلکی بە ئامانج گەیشتوو تیا ئەبینم با هیشتا ریگای سەختی سەرەو ژوری پڕ کوێرەوەیم نیوەبریش نەکردبێت ! چونکە ئەوانەی پێش منیش هەروەک من وابوون هەروەکو ئەوانەی دوای ئیمەش لە پلەیەکی هەورازتری ئایندەدا هەروەک ئیمە ئەبن !



ئامادەکردنی لەتیف هەڵمەت

# مەدهۆش و گفتوگۆیەکی سەربەست

خوێنەری خۆشەویست ... گۆڤاری ( بەیان ) بڕیاریداوە لەم ژمارەیەوە هەرجارەیَ گفتوگۆیەکی سەربەست لەگەڵ شاعیرێکی کورددا بکات ... شایانی بەسە ئەم گفتوگۆیانە لە سەر شریتی کاسێت تۆماردەکرێتو لە ئەرشیفی تایبەتی دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردیدا دەپارێزرێ ... دەرگای ئەم بابەتە بەم گفتوگۆیە لەگەڵ شاعیری ناسراوەماندا بە مەدهۆش دەکەینەوەو هیواداریین هەموو خوێنەرێك کەڵکی لێببینێت ...

**ل : ئەو کەسانەی کە بەرهەمی ئەدەبیو شیعر دەخوێننەوە هەموویان مەدهۆشی شاعیر دەناسن ... بەڵام پێمان خۆشە مامۆستا مەدهۆش خۆی ... خۆی بە خوێنەران بناسێنێو باسی ئەوەمان بۆ بکات کە چۆن هاوڕێتی لەگەڵ ئەم بووکە شۆخەدا . کە ناونراوە شیعر ... پەیدا کردووەو چۆن لەگەڵیدا کەوتۆتە خۆشەویستی .**

م : هێشتا شەش مانگ بووم لە سکی دایکمدا ... باوکم کۆچی دوایی کرد ... باوکم عەتاری داودەرمان فرۆش بو ... ناوی سۆفی محمد بو بە حەمەدیلان بەناوبانگ بو ، بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم کە پەیوەندی بە حەمە سالح دیلانی شاعیرەوە نیە ... باوکم کە مرد شتێکی وای لێ بەجێ نەما کە پێی پێبگەم ... مەگەر هەر خوا بزانێ بەچ کوێرەوەرییەك گەیشتمە ئەو تەمەنەی کە بتوانم خۆمو دایکم بژێنم ...

لە حەوت سالیمەوە چوومە حوجرەیەکو لەلای مەلا قورئانو کتێبە بچکۆلەکانو گولستانو چەند کتێبێکی ترم خوێند ... لە پاشان بەڕۆژ بووم بە شاگردی بەرگ دروو.. بە شەویش لەلای مەلا بووم بەفەقێ ... هەر لە منداڵییەوە هۆگری سروشت بووم ... حەزم دەکرد زۆر ترین کاتم چ بەیانیانو چ ئێواران لەقەراخ شار بە سەربەرم ... هەرچەند ئیشەکەم ـ بەرگ دروون ـ پەیوەندیمی لەگەڵ خەڵك بتەو دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا هەر حەزم لە ژیانی تەنیایی بو .. لە تەنیاییمدا زۆر جار دڵم شاد دەبو هەندێ جاریش پەستی دایدەگرتمو دەگریام ...

جوانی پەرست بووم ... بەڵام زیاتر حەزم لە جووڵانو رووداوو بەسەرهات کردووە ... زەردەخەنەیەك لە جێی خۆی دا بووبێ با دەمو لێوەکەشی جوان نەبووبێ زۆر بزواندوومی.. لەبەر ئەوە بەشی زۆری شیعرەکانم گێڕانەوەو باسی رووداوو بەسەرهاتە ... بەسەر هاتی خۆمو ئەو رووداوانەی کە بەرچاوم کەوتوون ... لەم رووەوە شیعری دوو شاعیرم زۆر لا پەسەند بووە ... یەکەمیان عەلی کەمال باپیرو دووەمیان فایەق زێوەر بەختیار ، ئەم دوو شاعیرە لە شیعر نووسیندا مەبەستی خۆ دەرخستنیان کەم بووەو هەر بۆ دڵو دەروونی خۆیان شیعریان وتووە .. ئێستاش کاك جەمال شار باژێڕی وەکو ئەوان ئەبینم ... حەزدەکەم ئەوەش بڵێم کە لە ساڵی ١٩٤١ لە کاتی هەراکەی رەشید عالیدا چووم بۆ لای کەمال عەلی باپیرو لەوێ یەکترمان ناسی ... لە دواییشدا کە هاتەوە بۆ سلێمانی پەیوەندیو هاوڕێتیمان زۆر زۆر بەهێزو بتەو بوو .

**ل : ئەو هۆ سەرەکییانەی کە پالیان پێوەنای بە تەواوەتی هۆگری شیعر بیتو ببیت** ◁

به شاعیر چین ؟

م : چەند هۆیەك پاڵیان پێوە نام کە ببم بە شاعیر ... یەکەم : مامۆستایەکی فارسی زانی ئەدەب دۆستی سنەییم هەبو ناوی مەلا میرزا بو لام وایە هەلا تووی ئەوسای ئێران بو لەمزگەوتی شێخ ئەولآی هەولێری مزگەوتی دوو دەرگا لە دەوروبەری ساڵی – ۱۹۳۰ – دا لەسەر شەقام قوتابخانەی هەبوو ... شێوەی دەرز وتنەوەکەی زۆر بەتامو چێژبوو ... بەتایبەتی کاتێ کە – گولستان – ی پێ دەوتینەوە ...

**ل : کەواتە لە پێشکەوتنی بەهرەی شاعیرێتیتدا خۆتان بە قەرزاری ئەو مامۆستایە ئەزانن ... !**

م : بەڵێ من لەم بوارەدا خۆم بەقەرزاری ئەو مامۆستایەم دەزانم ... هەروەها خۆم بەقەرزاری ئەو چاپکراوە کوردیانەش دەزانم کە لە سەرەتای بیرکردنەوەمدا هەبوون وەکو دیوانی سالمو نالیو نامیلکەی دیاری لاوانو یادگاری لاوانو ئەو شیعرانەی کە مامۆستا گۆران لەو دوونامیلکەیەدا بلآوی ئەکردنەوە ...

دەبێ ئەوەش بڵێم کە خوالێخۆش بووی دایکم هەموو قسەکانی شیعر بوو ... ئەگەرچی نەخوێندەوار بوو شتی وای دەوت کە سەرنجی رادەکێشا ... چەند جارێك بەهۆی شاعیرێتی دایکمەوە لەتەنگو چەڵەمەی رامیاری رزگارم بوە ... بۆ نموونە جارێکیان لە سەردەمی پاشایەتیدا بەند کرابووم دایکم چو بۆ لای وەزیرێکی کوردو شیعرێکی ناشیرینی پیاداوت .. بەڵام ئەو لەباتی ئەوەی شیعرەکە توورەی کات فرمانیدا لە بەندیخانە بەربدرێم ئەوەش لە بەرخاتری شیعرەکەی دایکم ... شایانی باسیشە دوو سێ جار شێخ محمدی خاڵو کاوێس قەفتان پێیان وتووم بۆچی شیعرەکانی دایکت کۆ ناکەیتەوەو لە چاپی نادەیت ؟ ..

**ل : مامۆستا شیعرەکانی دایکت هی خۆی بوون یا فۆلکلۆری بوون ؟**

م : هەندێکیان فۆلکلۆری بوونو هەندێکیشیان لەدەمی خەڵك دەبیستو بەپێی پێویست خۆی شیعری دەخستنە سەرو وای لێ دەکردن کە بۆ بۆنەیەك بشێن ... دەبێ ئەوەش بڵێم کە جێی داخە ئەو شیعرانە نەنووسراونەتەوە، بەڵام خۆم زۆر بەیانم لە بەرکردوەو هێشتاش هەر لەبیرم ماوە ... جارێکیان کامەران لەسەر دایکم لە رۆژی نوێدا شتێکی دەربارەم نووسیبوو .

**ل : کامەران چی بۆ نووسیبووی ؟**

م : من شیعرێکم بۆ خێزانەکەم نووسیبوو ... کامەران لەبارەی ئەو شیعرەوە نووسیبووی ئەبوایە ئەو شیعرەی بۆ دایکی بنووسیایە ... ئەبێ ئەوەشم لەبیر نەچێ کە بڵێم گەلێ لەکەسو کاری دایکم شاعیر بوون وەکو : مامۆستا نەجمەدین مەلا کە خاڵۆزای دایکمەو مەلا سەعدیو ئەخۆڵو مەلا حوسێنی . قازیو کامەران موکری ... باوکی دایکیشم مەلا ئەحمەدی مەلا عەلی بەزەلیل بەناوبانگبوەو شیعری هەیە ...

کە گەورەبووم بەشەو لە مزگەوتی شێخ ئەمین لەگەرەکی دەرگەزێن کەوتمە لای مامۆستایەك کاکە مەلایان پێ ئەوت ، خەڵکی پاوە بو ... ئەم مەلایە شارەزاییەکی باشی لە ئەدەبدا هەبوو گەلێ کەڵکم لەویش بینی ...

دوای ئەوسا چوومە قوتابخانەی زانستی ... ئەو قوتابخانەیە کۆڕێکی هەفتانەی هەبوو ... ئەو کۆڕەش شەوانی سێ شەمو ساز دەکراو شیعرو وتاری کۆمەڵایەتیو نیشتمانیو هەروەها گەلێ شیعری گاڵتەو گەپو رامیاری تیا دەخوێنرایەوە ... بێکەسو هەوریو گەلێ لە نووسەرانی ئەوسەردەمە هەروەها جار جاریش پیرەمێرد سەر لەو کۆڕانە دەدا ... ئەم کۆڕانەش زۆر کاریان لێ کردمو هەوێنی شاعیرێتییان خەستتر کردم ...

**ل : جگە لە بێکەسو هەوریو پیرەمێردا ، چ رۆشنبیرێکی کەی ئەوسەردەمە بەشداری ئەو کۆڕانەیان دەکرد ؟**

م : رۆشنبیری تر زۆربوون کە سەریان لەو کۆڕانە دەدا وەکو کەریم زانستیو حەسەنی شێخ حەمە مارفو گەلێ لە رۆشنبیرانی کەیش کە ناویانم لەبیر نەماوە ... بەشداریان لەو کۆڕانەدا دەکرد ... شایانی باسیشە مەکتەبی زانستی

لەو سەردەمەدا شێوەیەکی رامیاری هەبو ... لە پێشدا پیرەمێرد سەر پەرشتی دەکرد ... هەروەها کەریم زانستیش .. لەدواییشدا حەسەنی شێخ حەمە مارف زیاتر سەر پەرشتی ئەکرد ... لەبەر ئەوەی قوتابخانەکە بەیانەیەکی کوردەواری‌یانە دادەنرا هەر نوێنەرێك لە دەرەوەی ولاتەوە بهاتایە بۆ سلێمانی دیدەنی‌یەکی لێ دەکرد ... ئەم کوڕانەش کاریان تێ کردم ... بەلام ئەوەی کە کانی دەروونمی تەقاندو شیعرمی هەلقولان کچێکی دراوسێمان بو ... مارەبڕی منالێ بوو حەزی لەشووەکەی نەبو ... ئەو کچە سۆزێکی لەدلدا بو خووی دابوە گۆرانی‌و فۆلکلۆری کوردی ئەوەندەی لەبەربو من لە گەلی دەرنەدەچووم ... هەولمدا لە شێوەی فۆلکلۆری شیعری گۆرانی دانێم تاوام لێ هات ئەو لە گەلم دەرنەئەچوو ... ئیتر من بووم بە زەخیرەی شیعری گۆرانی ئەو ئەو شیعرە فۆلکلۆریانەی کە بۆ ئەو کچەم نووسیبو هانی دام زیاتر بچمە ناو جیهانی شیعرەوە .. هاوڕێکانیشم شیعرەکانمیان بەدل بوو ... هانیان ئەدام زیاتر بنووسم ...

**ل : مامۆستا یەکەم شیعرت کە بلاو کرایەوە چۆن بلاو کرایەوەو کام شیعرە بوو ؟**

م : جارێکیان شیعرێکم نووسی‌و بردم بۆ چاپخانەی ژین‌و پێشانی پیرەمێردمدا ئەویش لەتەنیشت خۆیەوە دانیام‌و وتی : کۆتایی شیعرەکە رێك‌و رەوان نیە ... بەلام لەپال ئەو قسەیەدا هانی دام کە لەسەر شیعر نووسین بەردەوام بم ... پیرە مێردی نەمر ئەو شیعرەمی لە رۆژنامەی ژیندا بلاوکردەوەو ئەمەش بەشێکیەتی :

**بە عەشقی تۆ برینـدارم عیلاجی دل ئەبێ چی بێ**
**کە تۆ رەحمت نەبێ بۆمن دەوای دەردم ئەبێ چی بێ**
**لە پێ کەوتم ئەوەن هاتم بەرۆژو شەو بەبەردەمتا**
**ئەگەر ماچێ ببەخشی پێم کرێ رێگەم ئەبێ چی بێ**
**ئەزانم دایما خۆ تۆ لە گولزاری لەگەل یاران**
**گولێ زیاتر لە گولزارت خەلاتی من ئەبێ چی بێ**

پاش بلاوکردنەوەی ئەم شیعرم .. هەرچی شیعرێکم بنووسیایە دەمبرد بۆ پیرە مێردو دەسکاری‌یەکی دەکردو بلاوی دەکردەوە ... هەموو جارێکیش پێی ئەوتم : عاشقە رووتە ... شایانی باسیشە - مەدهۆش - کە بوەبەناسناوم لە شیعری پیرە مێردو تاهیربەگدا بینیومەو کردوومە بە ناسناوی خۆم ... پیرە مێرد دەلێ :

**هەوری زام جەخار سەر سام‌و مەدهۆش**

تاهیربەگیش دەلێ :

**دلئەمرۆ مات‌و مەدهۆشە خوا فەصلی گولان بابێ**

ئەو سەردەمە حەزم لە هاوڕێتی بەهرەداران دەکرد ... لەکاتی لاویمدا زیاتر لە پیرە مێردو عەلی کەمال باپیرو فایەق زێوەر نزیك دەبوومەوە بەلام کەپیر بووم حەزم لە هاودەمیی بەهرەی هونەرمەندانی لە خۆم گەنج تر دەکرد ... تا لە سلێمانی بووم لەگەل کامەران موکری و کاکەی فەلاح‌و کاك عەلی شەونمدا پەیوەندیم زۆر بەهێز بوو ... کەتەنگ‌و چەلەمەی بێ درامەتی ژیان لە سلێمانی دووری خستمەوەو بۆ بەغدا چووم .. لەوێ زیاتر هاوڕێتی کاك محەمەدی مامۆستا عبدالکریمم کرد ...

**ل : مامۆستا ، سالی چەند بوو بۆ بەغدا بارتان کرد ... ؟**

**م** : سالی - ١٩٧٠ بو .. هۆی چوونەکەشم ئەرزاری‌و بێ درامەتی بو ئەوەبو خانوکەم فرۆشت‌و دامەوە بەقەرزدا‌و چووم بۆ بەغدا چونکە ئەوسا سلێمانی بواری ئیش کردنی وای نەبو کە پیاو بتوانێ قەرزبداتەوە ... بەراستی لەبەغدا کەلکی ئەدەبی زۆرم لە کاك محەمەدی مەلا کەریم وەرگرت ... دوکتۆر عیزەدینیش کە هەر لەلاویمەوە یارمەتی ئەدام ... گەلێ کتێبی تازەی بۆ دەهێنام ... لەم سالانەی دواییشمدا لەبەغدا واتا لە سالانی حەفتادا گەلێ لە رۆشنبیرانی بەغدا سەریان لێ دەدام لەوانە : دوکتۆر ئیحسان فوئادو کاك حسێن عارف‌و کاك جەمال شارباژێڕی‌و لەتیف هەلمەت ...

**ل : مامۆستا دیوانی - دلی کچان - و گەلێ هۆنراوەی ئەشت بەزمانی ئافرەتەوە نووسیوەو ئاشکراشە شاعیرێکی کۆنی عەرەب کە ناوی ( عمر بن ابي ربيعه )یە لە سەرزمانی**

**ئافرەت شیعری داناوەو شـاعیرێکی هاوچەرخی عەرەبیش کە ئەویش نزار قەبانی‌یەو زۆر ناسراوە لەسەر هەمان رێباز شــــیعری زۆر زۆرە .. ئایا ئێوە تا چ رادەیەك کەلکتان لەو دوو شـاعیرە وەرگرتووە ؟**

م : بروات بێ تەنها هەر ناوی نزار قەبانیم بیستوەو بەس ... ئیتر ئەتوانم بڵێم شیعرەکانیم ئەوەندە نەخوێندۆتەوەو ئاشـنایەتی‌یەکی ئەوتۆم لە گەڵیاندا نیـە کـە کەڵکم لێیان وەرگرتبێ ... هەرگیز شیعری ئەو دوو شـاعیرەی ناوت بردن کاریان لە رێبازی شــــیعری من نەکردوەو جێ پەنجەی هونەری ئەوانی پێوە نیە ... چۆنیەتی دۆزینەوەی ئەو رێبازەشم بەم جۆرەیە کەباســی دەکەم ، لە سەردەمی پاشایەتی‌دا لەبەندیخانە بووم کاك هۆشیار قەفتان وتی بۆچی شیعرێك ناڵێی کە تازە بێ‌و لە بەندیخانە رزگارت بو من لەســەر ئەرکی خۆم لە چاپیان دەدەم .. لە بەندیخانەکەی سلێمانی هەندێ شــــیعرم نووسی‌و پاش مانگێو نیوێك بەربووم‌و لەدەرەوەش کۆمەڵێ تـر شیعرم بەزمانی کچانەوە نووسی‌و نازانم بۆچی لەگـەڵ کاك هۆشیاردا . لە سەر چاپ کردنیان رێنەکەوتین.. ئەوە بودام بە کاك مەحموود خاکی‌و ئەو لەســـەر ئەرکی خۆی لە چاپی‌دا .. بەڵام زۆر هەوڵم نـەدا کە هۆنراوەی نوێ بکەم بەپیشــــــە ... چونکە لەلایەکەوە نەمویست سەر لە خۆم بشێوێنم‌و لـە رێبازی تایبەتی خۆم لابدەم ... لەلایەکیشــــەوە ســـــەرنجی هۆنراوە نوێکانم دەدا هەرچـەنـدە هۆنینەوەیان جوان‌و تەواو بوو بەڵام من ئەو چێژەم لێ وەرنەدەگرن کە لە هۆنراوەی نالی‌و ســــالم‌و شیعری کلاسیکیم وەرگرتوە .

ساڵی ١٩٤٩ لەسەر خۆپیشاندانێك لەگەڵ چەند هاورێ‌یەکدا لە بەندیخانـەی کـەرخ گیــرا بووین ... مانگێو نیوێ لەوێ بووین بەدر شــاکر سەیاب‌و مامۆستا شـــەرارەو بەحر العلوم لەوێ بوون جا نازانم هـەمـــان بەحر العـلوم بو کـــە شاعیرێکی ناسراوی عەرەبەو هەتا ئێستاش ماوە یاخود یەکێکی تربوو بەو ناســـناوە ... ئەوان شـەوان دادەنیشـتن‌و کۆڕی ئەدەبی‌یان دەبەستو شـیعریان دەخوێندەوەو منیش ئەوکۆڕانە زۆری دەبزواندم‌و هەســـتی شــــیعرمی زیاتر تووڵ دەکرد ...

**ل : مامۆستا مەدهۆش ، ئێوەش بەشداری ئەو کۆڕانەتان دەکرد ؟**

م : بەڵێ ... بەشـــداریمان ئەکرد بەڵام من لەبەر ئەوەی عەرەبی‌یەکـەم بێ هێزبوو رێی بەشداربوونم نەبو بەڵام لام وایە کاك حەمە صالح دیلان بەشداری دەکرد ...

**ل : ئایا ئەو شـــاعیرە کوردانەی کەلەوێ بوون کۆڕی شــــیعر خوێندنەوەیان بە کوردی دەبەست ... ؟**

م : بەڵێ ئەوانیش دەیـــان خوێنـــدەوەو بەتێـکەڵ دادەنیشــــتن‌و گفتو گـۆی ئەدەبی‌و بیروڕای ئەدەبییان شی دەکردەوە ...

**ل : مامۆستا حەزتان لەچ جۆرە شیعرێک هەیە .. ؟**

م : زیاتر حەزم لە شـیعری میللەتانی رۆژ هەڵاتە ، وەکو شـیعری نامیق کـەمـــالی تورك‌و تاگووری هینـدســــــتان ... بیری ئەم جۆرە شاعیرانە بیروژیانیان لە بیروژیانی ئێمەوە نزیکەو لە نێوانی ئێمەو ئەواندا لێکچوونێك هەیە .

لە شاعیرە کوردەکانیشـدا حەزم لەشـیعری هێمن‌و هەردی‌و دیلان‌و جەمال شـــارباژێڕی‌و ع . ح . ب هەیە ... بەدرێژایی ســــاڵانی خەریك بوونیشم بە هونەرەوە وام لێ هاتووە بەو چاوانە سەیری بەرگ دروون بکەم کە تەماشــــای شیعری پێ دەکەم ئەو زەوقەی کە لەبەرگ دروون وەرم گرتووە بەتامی شـــــیعرێکم زانیوەو ئەبێ ئەوەش بڵێم کە لەماوەی پەنجا ســــالی بەرگ درووندما لـــە نانەســـــکی‌یەکە بـەولاوە هیـچ دەسکەوتێکی ترم نەبووە ...

**ل : پاڵەوانی شیعرەکانت کێن ؟**

م : پاڵەوانی شیعرەکانم ئەو روو داوانەن کە بەبەرچاومدا رادەبوورن لەوانەیە هەندێ جـار مەبەستی جیا جیام لەپارچە شــــیعرێکدا کـۆ کردبێتـەوە ... وەختی خـۆی کــە نـامیلکەی هەمیشە بەهارم نووسی بردم بۆ خوالێخۆشـــبو مامۆستا زێوەر ... لە ماڵی ســـەعید ئەفەنی کابان‌بو پەســـــەندی کردو وتی منیش یەك دوو پارچە شیعرت ئەدەمێ‌و بیانکە بەنامیلکەیەك ... لەپاشدا مامۆستا حەمە بۆر کە بەهۆشـــــەنگ

ناوداره لەگەڵ یەك دوو هۆنراوەی خۆیو هۆنراوەیەکی مامۆستا زێوەرو هۆنراوەیەکی فایەق زێوەردا کۆی کردنەوەو ویستی لەچاپیان بدات توانای چاپ کردنیمان نەبو نرخی کتێبەکەمان بە بیستو پێنج فلس دانابوو بەڵام بۆ ئەوانەی کە بەر لە چاپکردنی پارە دەدەن بەبیست فلس دەمان دانێ بەو جۆرە توانیمان لەسەر ئەوە رێ بکەوین کە پیرە مێردی نەمر لە چاپخانەی ژین – ٢٥٠ – دانەمان بۆ لە چاپ بدات ... لە نیوەی کارەکەدا هەراکەی رەشید عالی رووی‌دێ چاپخانەکەی داخرا ... دوای ئەوسا بە یارمەتی چەند دڵسۆزێك لە چاپخانەیەکی تر لە بەغدا کارەکەمان بە ئەنجام گەیاند ... شایانی باسە کتێبی هەمیشە بەهار هەتا ئێستا شەش جار لەچاپ دراوە ...

**ل : مامۆستا هیچ دیوانێکی کەت زیاد لە جارێك لە چاپ دراوە ؟**

م : بەڵێ ... دیوانی – دڵی کچان – م . دوو جار لە چاپ دراوە ...

**ل : مامۆستا تائێستا چەند بەرهەمی خۆتانتان بەچاپ گەیاندوە ؟**

م : بەرهەمە چاپکراوەکانم ئەمانەن :

**١ – شیرین : شیعر**
**٢ – دڵی کچان : شیعر**
**٣ – دڵی کوڕان : شیعر**
**٤ – دڵو گڵ : چیرۆك**
**٥ – سەرگوڵ : چیرۆك**
**٦ – نەریمان چی لێ هات ...**

**ل : مامۆستا پرۆژەی ئەدەبی داهاتووتان چیە ؟**

م : ئێستا دوو پرۆژەی ئەدەبیم بەدەستەوەیە ...

**یەکەم** : هەموو هۆنراوەکانم لە بەرگێکدا بەناوی – یانەی دڵان – کۆ کردۆتەوەو کاك **محمدی مەلا کەریم پێشەکی بۆ نووسیوەو هەر** بەسەرپەرشتی خۆیشی لە چاپی دەدەم ... شایانی باسە بۆئەم کارەش دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی بڕیاری داوە یارمەتییەکی گەورەم بدات ...

**دووەم** : چیرۆکێکم بەدەستەوەیە بەناوی ( کەرەسە ) پێشانی گەلێ نووسەرم داوە وەکو کاك حەمە فەریق‌و ع شەونم مامۆستا هەردی‌و کاك ئەمینی میرزا کەریم ... هەریەکەیان رەخنەی تایبەتی خۆیان هەیەو بەڵام هەموویان خاڵێکدا یەك دەگرنەوە ئەویش ئەوەیە کە چیرۆکەکە لاوازە .. بەڵام کاك ئەمینی میرزا کەریم وتی : هەرچەند لاوازە کەرەسەی زۆری تیایە ... منیش لەسەر ئەو قسەیەی ئەو بڕیارمدا ناوی چیرۆکەکەم بنێم کەرەسە ...

**ل : مامۆستا وەکو ئاگادارین ئەو ساڵانەی کە لە بەغدا بووی بەرنامەیەکت لە ئێزگەی کوردی بەغداوە بەناوی – لەگەڵ شاعیرە گەنجەکاندا – پێشکەش دەکرد ... رەنگە گەلێ شاعیری گەنج کە ئێستا بەهەر هۆیەکەوە بێ وازیان لە نووسین هێنا بێ بەشداری ئەو بەرنامەیەیان کردبێ ئایا چەند ناوێکتان لەبیر نیە لەو ناوانەی کە بەرهەمی سەرکەوتوویان بۆ بەرنامەکە دەنارد ...**

م : گەلێ شاعیری گەنجم بە هۆی بەرنامەکەوە ناسی‌و لە ناو ئەو شاعیرە لاوانەشدا گەلێ شاعیری دوارۆژ روونم لەلای خۆمەوە دەستنیشان کردبو وەکو لە بیرم مابێ :– کاك علی حەیدەر حسێن لە سلێمانی‌و کەریم مام رەش لە هەولێرو ئەمین چاورەش لە رەواندزو سیف الدین نامیق لە سەرچنار ... شایانی باسیشە لە بەرنامەکەدا گەلێ نوکتەی شاعیرانە رووی دەدا یەکێ لەونوکتانە ئەوەبو شاعیرێکی لاو بەناسناوی دڵشکاوەوە شیعری بۆ بەرنامەکە دەنارد ... پێموت کە دەبێ رەشبین نەبێ‌و ناسناوی دڵنیا بۆ خۆی هەڵبژێرێ ... لە وەڵامدا وتی : ئەگەر دڵشکاو نەبوومایە چۆن دەبووم بە شاعیر ... هەروەها ماوەیەکیش لە چەمچەماڵەوە کوڕێك‌و کچێك شیعریان بۆ دەنارد لێی ورد بوومەوەو بۆم دەرکەوت ئەم دوانە دڵدارن‌و دەیانەوێ بەهۆی بەرنامەکەوە شیعر ئاراستەی یەکتری بکەن ... ئەبێ ئەوەشم لەبیر نەچێ لەناو ئەوکچانەدا کە شیعریان بۆ بەرنامەکە دەنارد چەند کچێك هەبوون شیعری سەرکەوتوویان دەنووسی لەوانە : رووناك حەسەن حسێن لە ئامادەیی

پیشەسازی سلێمانی ساڵێ دووساڵ بە شیعر هاوبەشی بەرنامەکەی کردو ئیتر دەنگی نەما ... هەروەها کچێکی‌تر بەناوی ساکار ئەحمەد لە تووی مەلیك لە سلێمانی هەتا ساڵی ١٩٨٠ هەر هۆنراوەی بۆ بەرنامەکە دەنارد ...

**ل : مامۆستا ئێوە وتتان شیعرەکانتان زیاتر باسی رووداوە .. جا ئێوش وەکو شاعیرێکی هەست ناسك شیعرەکانتان جۆش‌و خرۆشێکی زۆری تیایە ، ئایا دەتوانن هۆنراوەیەکمان پێشکەش بکەن پەیوەندی هەبێ بەرووداوێکی تایبەتی‌یەوە ؟**

م : ئەم شیعرەی کە ئێستا بۆتی دەخوێنمەوە پەیوەندیەکی تەواوی بەژیانمەوە هەیەو ئاراستەی ئافرەتێکی دەکەم وەختی خۆی زۆری خۆش دەویستم ... کەچی دوایی منی بەسامان‌و تەلاری دونیا گۆڕیەوەو ئێستا بەپارەی زۆرو دارایی دنیاوە دەنازێ :

**وەزانێ چونکو ئێستا بۆتە خان**
**رازاوەتەوە وەك بووکی باخان**
**لەراستی ئێمە خۆی لێ گۆڕاوە**
**لووتی لێ کردووین بەلای ئەولاوە**
**کاتێ من ئەمویست وەکو تۆی ئاوبو**
**پەڕەی رووی گوڵی نەژاکێنراو بو**
**مەمکی جێی نیوەی ناودەسێ نەبو**
**دەمی جێی دەنکی چەرەسێ نەبو**
**ئێستا بام لای خۆی شای ناوژنان بێ**
**دەستەی رۆتینی دەولەمەندان بێ**
**من تەڕو تازەو ناسکۆلەم ئەوێ**
**تا ئەم دلە بێ پەکم ناکەوێ**
**من جوان پەرستی‌و ئەو خۆ پەرستی**
**هەریەکم خۆی‌و دلی‌و پێویستی**

**ل : مامۆستا راتان دەربارەی شیعری لاوانی ئەم سەردەمە چیەو تا چ رادەیەك پەیوەندیتان لەگەلی دا هەیە ... ؟**

م : بەراستی بەرهەمی چەند شاعیرێکی لێ دەرچێ ئەوانی‌کەی ناتوانین بە شیعری سەرکەوتووی دابنێین دەتوانم بلێم شیعری لاوانی ئەم سەردەمە زۆرو بۆرە ... !

**ل : مامۆستا هەندێ کەس رایان وایە چۆن دار پیردەبێ‌و ئیتر بەروبوومی نامێنێ یا چۆن لە کاتی پیری‌دا مرۆڤ چاوی کز دەبێ‌و گوێی گران دەبێ ئەئاوا شاعیریش لە کاتی پیری‌دا لەوانەیە چاوگەی هەڵبەستی بداتە کەمی ... یا هەر وشك بکات ... ئایارای ئێوە لەم بارەیەوە چیە ؟**

م : شیعر پێویستی بەرووداوو جوولان‌و شتێك هەیە کە کارت تێ بکات ... هەروەها پێویستی بە خوێندنەوەی زۆریش هەیە ... جگە لە وردبوونەوەی قووڵ لە جوانی‌و ئەفسوونی سروشت ... لە راستیشدا شاعیری پیرو بەساڵاچوو بەپێی تەمەنی خۆی بەتەواوی ئەوانەی بۆ نالوێ کە باسمان کردن ... بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە شاعیر پیر بوو چوو بەساڵدا ئیتر پەکی دەکەوێ‌و هیچ نانووسێ ... بەڕای من هەموو شاعیرێکی رەسەن ئەوەندەی یادگارو بیرەوەری هەیە کە بتوانێ لە دوا ساڵەکانی ژیانی‌دا شیعری سەرکەوتووی پێ بنووسێ ...

**ل : مامۆستا ئەگەر خۆتان رەخنەگرین .. راتان چی‌دەبێ دەربارەی شیعرەکانی - مەدهۆش - .**

م : رام بەرامبەر شیعرەکانی مەدهۆش ئەوەیە کە سادەن بەلام لە دلێکی بە سۆزەوە هەلقولاون‌و سەرکوزشتەی مرۆڤ‌و رووداوی دەوروبەری خۆمانن ... من هەموو شیعرەکانی مەدهۆشم خۆشدەوێ ... بەلام شیعر هەیە لە بەر هەندێ هۆی تایبەتی لە شیعری‌تر خۆشەویستترە ... بۆ نموونە جارێکیان کچێك بۆ جل‌دروین هاتو چۆی دەکردم ... کچە کە قوتابی بو لە زانکۆی بەغدا هاتە لام‌و داوای لێ کردم کەبەبۆنەی سەرکەوتنی‌یەوە لە زانکۆ شیعرێکی بۆ بنووسم ... بەراستی منیش چاوەڕوانی قسەیەکی وابووم لەو کچەوە ... ئەو شیعرەی بۆ ئەو کچەم نووسیوە زۆرم خۆش دەوێ‌و ئەمەش سەرەتاکەیەتی :

**لەزانکۆی تەکنەلۆجی دواپلەی زۆر باشی هێناوە**
**لەوانەی خۆشەویستی‌دا وەکو ساوایە وەستاوە**

**ل : مامۆستا! تۆ ئەم شیعرەت لەسەر داوا کردنی کچێك نووسیوە هەندێ کەس رایانوایە**

**که شیعرێك بەبۆنەیەکەوە یا لەسەر داواکاریەك بنووسرێ شیعرێکی رەسەنو سەرکەوتوو نـەمـر نابێ ... ئێوە لەمبارەیەوە راتان چیە ؟**

م : من تا ئێستا چەند جارێك داوایان لێ کردووم که شیعر بە فلانە بۆنەوە بنووسـم ... من لام وایە شیعری وا ئەگەر بیشینووسم بەهێز نابێ ... بەلام من ئەو کچەی که داوای لێ کردم شیعری لە سەر بنووسم سۆزێکی تایبەتی خۆمم لە دەروونـدا دەربارەی هەبوو خوا خوامبوو داوای کاری وام لێ بکات ... لەبەر ئەوە شیعرەکەم بە جۆشو خرۆشێکی تایبەتیەوە نووسی ... ئەگینا گەلێ کەس داوای شـتیوای لێ کردووم هـەر بەقسـەخلافاندوومە تـا بێزاربوە یـا لەبیـری چۆتەوە ...

**ل : لەبارەی شـیعری تازەوە راتان وابوو که زۆرو بۆرە ... ئایا بەرای ئێوە سـەرجەمی شیعری کلاسیکیمان هەمووی هەر سـەرکەوتوو شاکارە ... ؟**

م : بەرای من لە شیعری کلاسیکیماندا لە پال شیعری سـاکاردا شیعری پڕوپووچیش زۆر زۆرن و ئەگەر وا نەبوایە شێخ رەزا نەیدەوت :

**چونکە شاعیر زۆر بوە لـەم عەسرەدا**

**بۆتە حەشری نێرەکـەر لـەم حوجرەدا ...**

ئەم شیعرەی شێخ رەزا نارەزایی خۆی لـە شـیعری ئەو کاتە دەگەیەنێ ... من لەبیرمە خوالێخۆشبو فایەق بێکەسیش دەیوت : نابرووی شیعریان برد ئەوەندە شیعری نابوتیان وت ... حەیای شیعر چو ...

**ل : هەندێ کەس دەلێن : کورد شـاعیری گەورەی زۆرەو هەقی وایە ئیتر نووسەرانی کورد بایەخی زیاتـر بەلایەنەکانی تری ئـەدەب بـدەنو تارادەیەك شـیعر پشـت گوێ خەن ئایا ئەمە راستە !**

م : ژیانی میللەتی ئێمە بەدرێژایی گەردون پڕبوە لە ناخوشیو تەنگو چەلەمە ... ئەمانـەش تەنها بەشـیعر دەربڕاون و باسـیان کراوە ... هەروەها ئاوو هەواو خۆشیو جوانی ناوچەکەمان بونەتە هەوێنی شـیعری شـاعیران ... شاعیریش که خەیالی شیعری کەوتە سەر کەس ناتوانێ پێی بگوێرێو بلێ شیعر مەنووسـەو چیرۆك بنووسە ... بو نموونە من ئێستا بەرگ دروم ... ئـایـا دەبێ کـاری ئاسـنگەری بکەم ... !؟

جگە لـەوەش ئێمە وەکو هیچمان نیـە بـا شیعرەکەمان هەبێو پوختتری بکەینو زیاتر بەرەو پێشەوەی بەرین ... بەم بۆنەیەوە من شـتێکی کەشم لەبیرە ئەویش پەیوەندی گۆرانیو شـیعرە بەیەکەوە ... ئەوانەی کـە گۆرانی دەلێن ئـەبێ گۆرانیەك بلێن لەگەل ئەوبۆنەیەدا بگونجێ کـە گـۆرانی بـۆ دەلێن .. دەبینی لـە زەماوەنێکدا گۆرانی بێژ باسی دەس لێکبەردانو دوژمنایـەتیو تۆران دەکات ... ! لە راستیدا ئەماناشێو دەبێ گۆرانی بێژ گۆرانی یەك بلێ لەگەل خۆشیو گەشی زەماوەنەکەدا بگونجێ ...

**ل : مامۆستا وابزانم ئێوە شـیعری گۆرانینان هەیە ؟**

م : بەلێ ... شیعری ئەمشەو شـەوی بەراتە شیعری منە ... هەرچەندە لەپێشـدا رێکەوتین کـە شـیعرێك لەسـەر داواکاری بنووسرێ سەرکەوتوو نابێ ... بەلام ئەگەر شتێ خۆم ئارەزووم لەسەری بێ شیعرێکی سەرکەوتو دەبێ ... ئـەم هۆنراوەیـەم لـە سەر داواکاری ئازادی کوڕم نووسی ... ئەوسا منالکاربو ... داوای لێ کردم شیعرێکی بۆ بنووسم ... دیاری نەکرد چی بۆ بنووسـم هـەر وتی حەزدەکەم شیعرێکم بۆ بلێی بۆ خۆشەویستێکمی دەنێرم .. منیش بۆم نووسی ... شیعرەکە لەدواییدا چاپ کراو کرابە گۆرانیش ...

**ل : هەندێ لە شاعیرانی ئێسـتامان لاسـایی شـیعری ئەوروپاییان هەر جۆرە شیعرێکی بێگانە دەکەنەوە ... گەلێ لە شاعیرانی کۆنیشمان لاسایی شـاعیرانی دەوروبەریان کردۆتەوە .. ئایا سەرچاوەی سروشی شـیعری ئەمڕۆمان کەلەپووری شـیعری خۆمان بێ یـا شاعیرانی ئەورووپاو شیعری بێگانە ... ؟**

م : لاسایی کردنەوە هەربوە ... نووسەر چی دەخوێنێتەوە ئەوە لە نووسینەکانیدا رەنگ دەداتەوە ... شـاعیرە تازەکانمان زیاتر ئـەو بابەتانە دەخوێنینەوە کـە لـە ئەدەبی بێگانەوە

کراون بە کوردی ئەمەش کاریان تێدەکاو لەبەرهەمیاندا خۆی دەنوێنێ بەڵام هەق وایە شاعیر ئێستا وەك شاعیری کۆن نەبێ ... چونکە شاعیری کۆن هەرچەندە خاوەن بەهرە بووبێ ئەو بوارەی بۆ نەرەخساوە کە بۆ شاعیری ئێستا رەخساوە ... شاعیری کۆن هەرچەندە خاوەن بەهرە بووبێ ئەو بوارەی بۆ نەلواوە کە وابیر بکاتەوە ئەبێ ئەدەبەکەی خزمەتی گەلەکەی بکات ... لەبەر ئەوە شاعیری نوێ دەبێ لەناو جەرگەی میلەتەکەی خۆیەوە هەڵبژێرێ ، بەڵام بەرگێکی تازەو جوانی بەبەردا بکات ... من خۆم بەرگ درووم ئەم جلە کوردییانەی ئێستا هەیە لەگەڵ جلی کوردی سی ساڵ لەمەو بەردا زۆر زۆر جیاوازی هەیە .. بەڵام شێوە بنەڕەتییەکەی تێکنەدراوەو جوانییە رەسەنەکەی پارێزراوە .. مەسەلەی شیعریش هەروایە شاعیرە نوێکانمان دەتوانن لەسەر رووناکی شیعری کۆنمان پەرە بە شیعری کوردی نوێمان بدەن و بابەتی وابێننە کایەوە لەگەڵ پێشکەوتنی ئەم سەدەیەدا بگونجێ ... شیعری نوێمان دەبێ جگەر گۆشەی شیعری کۆنی خۆمان بێ ... هەر شیعرێکیش وانەبێ ئاوەکییەو خزمەتی ئەم گەلە ناکات ...

**ل : ئێستە گێرەو کێشەیەکی گەورە لەسەر رەخنەی کوردی هەیەو وای لێ هاتوە دەڵێن رەخنە نووسین پەیوەندی بەجۆری پەیوەندی نێوان نووسەرو رەخنە گرەوە هەیە ... حەز دەکەم بۆ ئەم مەبەستە باسی رەخنەی کوردی لە ساڵانی سەرەتای لاوێتیەوە دەس پێبکەیت و ناوی چەند رەخنە گرێکی ئەوسەردەمەش بڵێی ... !**

م : لەسەردەمی لاویمدا چەند رەخنەیەکیان لێ گرتم یەکێ لەوانە مامۆستا هەردی بوو ... لە گۆڤاری گەلاوێژا رەخنەی لەسەر نووسیم و منیش پاش دوو ژمارە وەڵامی رەخنەکەیم دایەوە لە راستیدا ئێستا رەخنەکەی ئەوم بەدڵەو نەوەڵامەکەی خۆم ... هەروەها فایەق بێکەس رەخنەی لەمەنگووڕی گرت و میرزا مارف لە پیرە مێرد ... شایانی باسیشە ئەم رەخنانەی هەمووی لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاو دەبوونەوە ...

دەربارەی رەخنەی تازەش دەڵێم رەخنە شتێکی زۆرباشە ، گەلێ جار من شیعری یەکێکم نەخوێندۆتەوە کە رەخنەکە ئەخوێنمەوە ئەگەڕێم کتێبە رەخنە لێ گیراوەکە دەدۆزمەوەو بەوردی دەیخوێنمەوەو بەراوردی دەکەم لەگەڵ رەخنەکەداو گەلێ جاری وا هەیە بیروراکانی رەخنەگرەکە پەسەند ناکەم ... شایانی باسیشە هەندێ جار هەردووکیانم بەدڵە .. جارجاریش واهەست دەکەم کە رەخنەکە جۆرە قینەبەرییەکی تیادایە.. بۆ نموونە ئەگەر هاتو رەخنەگرێك رەخنەی لە شیعری شاعیرێك گرت کە بیرو باوەڕی وەك ئەو نیە ئەوە با شیعرەکەشی جوان و بە هێزبێ ئەو بەلاوازی لە قەڵەم دەدات ... جگە لەمەش شتێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە هەموو رەخنەکان لەدەورو بەری چەند نووسەرێکدا دەخولێتەوەو لە بازنەیەکی تەسکدایە .. باشتر وایە ئەو بازنەیە بشکێ و بواری رەخنە بەرەڵا کرێ و هەموو بەرهەمێکی ئەدەبێ بگرێتەوەو تەنها لە نێوانی چەند نووسەرێکدا خول نەخوات .. ئەبێ ئەوەشم لەبیر نەچێ لە کاتی خۆیدا گۆڤاری گەلاوێژ نووسی هەر کەسێ رەخنە ئەگرێ دەرگاکراوەیە .

**ل : بەر لە گەلاوێژ رەخنە نەبو ؟**

م : بەر لە گۆڤاری گەلاوێژ من ئەوەندە ئاگاداری ئەو بابەتە نەبووم چونکو من لە ساڵانی ١٩٣٠ - ١٩٤٠ دا زۆر پەیوەندیم لەگەڵ خوێندنەوەدا قووڵ نەبوو ... هەروەها ئەوەندا هاوڕێتیم لەگەڵ گۆڤارو رۆژنامەدا نەبوو ... من زیاتر لە چلەکان و پەنجا کاندا پەیوەندیم لەگەڵ خوێندنەوەو گۆڤارو رۆژنامەدا پەیدا کرد ... لەو ماوەیەشدا جارێك فایەق زێوەر رەخنەی لێ گرتم ... هەروەها حەمە سەعید ناکام و حەمە صالح دیلانیش رەخنەیان لێ گرتم و ئەم رەخنانە زۆر تر لە گۆڤاری هیوادا بڵاو دەکرانەوە ...

**ل : مامۆستا چۆن تەماشای سامانی ئەدەبی کوردی دەکەن ئایا هەرچی بەرهەمی لە پێشینانی ئێمە بە جێمابێ شایانی ئەوەیە بایەخی بدرێتێ و لەچاپ بدرێ ؟**

م : من وادەزانم هەرچی سامانی کۆنی ئەدەبیمان هەیە کۆبکرێتەوەو لە چاپبدرێ شتێکی باشە ... بادوای چاپکردنیان رەخنە گری بەتوانا شەن و کەویان کات و باش و پووچیان لەیەکتری جیابکاتەوە ... من لەگەڵ ئەوەدانیم هیچ بەرهەمێکی ئەدەبی کۆنمان پشتگوێ خرێ ... !

**ل : لە سەردەمێکدا کە ئینگلیزە داگیرکەرەکان ئەم ناوچەیەیان داگیرکردبو ... شاعیرانی ئێمە بە شیعری نیشتمانیو نەتەوایەتی بەرگریبان دەکرد ... بەلاّم لە هەمان کاتدا شیعرەکانی ئێوە هەرباسی خۆشەویستی ئافرەتو دلداریو چاوی کاڵو پرچی رەشی دەکرد ... دەبێ ئەمە هۆی چیبێ !**

م : هەر شاعیرێك رێبازێکی تایبەتی خۆی هەیەو منیش خاوەنی رێبازی تایبەتی خۆمم ... بۆ شیعری نیشتمانیو دلداری ئەگەر شتێکیشم بە خەیالدا هاتبێ هەر دەرخواردی شیعرە دلداریەکانمداوە ... لەسەرێکیشەوە هەرچەند خۆم هەولم دابێ یابلێین تێکۆشانێکم کردبێ بۆ بەختەوەری نیشتمانەکەم لەهەمان کاتدا بەخۆمدا رانەپەرمووم کە شیعری نیشتمانی بنووسم چونکە لەوە ترساوم نەتوانم بەکردار ناوەرۆکی شیعرەکەم بە ئەنجام بگەیەنم ... ئەتوانم بلێم ئەوەی بەشیعر بیلێم دەتوانم بەکرداریش جێبەجێی کەم ... بەلاّم ئەگەر بەهەر هۆیەك ئەوەم بۆ جێبەجێ نەکرا ... ئەوسا بەرانبەر بە نیشتمانەکەم درۆزن دەردەچم ... بەلاّم شیعری دلداری بۆ خۆشەویستی خۆمی دەلێمو ئەگەر پێ بەپێی شیعرەکەش نەرۆیشتم خۆشەویستەکەم رەنگە لێم ببووری ... ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کەدرۆ لەگەڵ خۆشەویستدا شتێکی جوانە ... !

**ل : گەلێ لە شیعرەکانت بەتایبەتی ئەوانەی دیوانی ـ دلی کچان ـ تاقیکردنەوەی کچانەو ئەیانگێڕینەوە ... ئایا خۆتان ئاگاداری ئەو تاقیکردنەوانەن یاخود هەر بەگشتی باری سەرنجی خۆتانە بەرامبەر بەئافرەتی ئەم ناوچەیەو دەری دەبڕن ؟**

م : هەرچەندە بابەتەکانم خەیالی خۆشمی زۆر تیایە ... بەلاّم بەهۆی ئەوەوە کە بەرگ درووی ژنانم تێکەلیو هاورێتیم لەگەل ژناندا زۆرەو زۆر بوەو گەلێ رووداوو دەنگو باسو تاقیکردنەوەی خۆیانیان خستۆتە بەردەستمو منیش کردوو من بەشیعر ... جگە لەوەش ئەو شتانەی کەمن لە شیعرەکانمدا باسم کردوون شتی گشتینو لە جەرگەی کۆمەلەوە دەرم هێناونو خستوومنەتە سەرکاغەز .

**ل : مامۆستا ... ئایا هیچ شیعرێکی نیشتمانیتان نیە ؟**

م : شیعری نیشتمانی لە چاپدراوو لە چاپنەدراوم نیە ... بەلاّم لە هەندێ هەلبەستدا بیروڕای رامیاریم دەربڕیوەو بەلای سۆزی نیشتمانیشدا چووم بۆ نموونە شیعرێکم بە ناونیشانی نەورۆز وتوە تیادا وتوومە :

**ئەی کیژەکانو لاوەکان**
**ئەی پیرو ناتەواوەکان**
**بەهار واشانی راتەکان**
**زستانی دایە بەرتەکان**
**بەفرو چلوورەی دەرپەڕان**
**سەوزەگیای وردی ناردەبان**
**دەوری شارخۆشبو بۆگەڕان**
**ئاسانبو وەعدەی پێگەیان**

**ل : مامۆستا حەزدەکەین شیعرێك لەو شیعرە دلداریانەی خۆتان پێشکەش بەخوێنەران بکەن ... کە بەلاتانەوە خۆشەویستەو خۆشە ...**

م : ئەتوانم ئەو شیعرەتان پێشکەش بکەم کەوتم کچێکی قوتابی لە بەغداوە داوای لێ کردوومو دێرێکیشم لێ خوێندەوە ... ئەمەش تەواوی شیعرەکەیە بەناوی ـ عەشقو پیری ـ یەوە ..

**لە زانکۆی تەکنەلۆجی دواپلەی زۆر باشی هێناوە**
**لەوانەی خۆشەویستیدا ئەلێی ساوایە داماوە**
**بەخۆی زانیوە چەن دل بۆی خەریکی پالە پەستۆیە**
**تەماشای خۆی دەکا وەك دیل بەچاوان دەوری گیراوە**
**دلی خۆشە کە دەرگای خۆشەویستی بۆی لەسەرپشتە**
**بەلاّم نازانێ کام دەرگا بەهەشتە ... کامەیان داوە**
**بلێن بابێتە لای پیرێکی وەکمن دەرزی وادادەم**
**کە خۆی جوان هەلبژێرێ نەك بلێن جوان هەلبژێرراوە**
**ئەگەر ویستم بلێم چاوم کزە بامن نزیکتربم**
**بەشەرمێك پێم ئەلێ ئەی مامە پیرە چیت لەمن داوە**
**لە ترسی تیرو توانجی خۆیو خەلکی گەرچی لێی دوورم**
**بەلاّم دل هەر ئەلێ بۆپێشەوە ئاشق نەترساوە**
**لەسەر تەختی دلم کۆشکێ دروست شۆخی ئەندازیار**
**زەوی ئێستا گرانە شوێنی خانووی گەورە کەم ماوە**
**بەراستی پیر بەپێی جوان بۆسەفەر هەنگاوی برناکا**
**دلم هەر رام ئەکێشێ تاملم ئەشکێ بەرێگاوە**
**ئەبێ پیر دوور بەدوور هەر سەیری بالاّو بەژنی جوانانکا**
**لەبەر تیشکی گڕاداری وشك خۆی بگرێ سوو تاوە**
**ئەوەی ئاواتی لاویم بو بە پیری هاتە بەر دەستم**
**چ خۆشە گەر بیستم خۆشەویستم بەختی هێناوە**
**بلێی رۆژێ ئەویش پیر بێتو ئەم جوانیەی لەدەس بڕوا**
**کە سەیری خۆی بکا شیوەن بکا لەو گەنجە چی ماوە**
**ئەبێ ئەو سا بلێ پیرێ هەبو خۆشی ئەویستم زوو**
**هەزار رەحمەت لە گۆڕی ئەو دلەی بێکەس بەجێماوە !**

# کۆڕی کورتە چیرۆکی کوردی

**ـ بەشی چوارەم ـ** ئامادەکردنی : **کمال غەمبار**

● **کاك ئەنوەر محمەد طاهر** : لە مەسەلەی ئایدیۆلۆژییەت دواو گوتی : پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە بەس دەڵێین هەموو گفتوگۆیەکە لەسەر باسێك ڕۆیشت ئەویش ئایا ئەدیب پێشرەو بێت یان لەگەڵ میللەتەکەی بڕو دوای بکەوێ ؟ . وا بزانم ئەگەر نووسەر پێشرەو بێت یان نەبێ هەر لەو ئایدیۆلۆژییەتە بکرێنێتەوە کە لە ناو میللەتەکەیدا هەیە یان چەند فەیلەسووفێك دایان ناوە ؟ بەرهەمەکەی بە پێشکەوتوو نادرێتە قەڵەم . « بەیاتی » دەڵێ : **ئەدیب دەبێ پەیامبەری میللەت بێو خۆی فەلسەفەی خۆی دابنێ ، چونکە ئەگەر هیچ داهێنانو خستنە سەرێك لە بەرهەمەکەیدا دەبێتە چی ؟ هەر دەبێتە دووبارە کردنەوەی کەسانی پێش خۆی .** وەك « هاڤلد » دەڵێ : ئەگەر داهێنانم نەبێ خۆم بکوژم باشترە . ئەدیب ئەگەر داهێنانی نەبێ دەمرێ . دەربارەی قسەکانی کاك فۆادو کاك ڕەئووفیش دەڵێم : ئەدیب دکتۆر نیە چارەسەری هەموو نەخۆشییەك بکات ، یان چارەسەرکەری هەموو نەخۆشییەك بکات ، یان چارەسەرکەری گیروگرفتی بێت « حلال المشاکل »و هەموو گیروگرفتییەك چارەسەر بکات . باشە « الاخوة کارامازوف » چ گیروگرفتییەك چارەسەر دەکات ؟ کابرایەکی دەوڵەمەند ، باوکی خۆیدەکوژێت ، ئەمە چ چارەسەر دەکات ؟

● **کاك اسماعیل ڕەسووڵ گوتی : (( ئەدەب دەبێ ئەدەب بێو دوور نەبێ لە گیروگرفتییەکانی ژیانو خەمو پەژارەی ئادەمیزادی هاوچەرخ ))** . با بڵێین بلزاكو هۆگۆو .. هتد . بڕوا ناکەم ئەوانە لەڕووی سیاسییەوە خاوەنی بیرێکی سیاسی ڕێكوپێك بووبن ، بەڵام وەکو ئەدیبو ڕۆشنبیر خاوەنی فیکری خۆیان بوونو ، باری کۆمەڵایەتیو ئابووریو سەردەمی خۆیان کاری تێکردوونو ، زیاتر لە ڕۆشنبیری ئاسایی هەستیان بە واقیع کردووەو توانیویانە لە دیاردەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتیو بزوتنەوەی کۆمەڵایەتیی سەردەمی خۆیان بگەنو وەستایانە بیانخەنە ڕوو . گەورەیی ئەدیبو ئەدەب لەو خاڵەدا دەردەکەوێ ، لەوانەشە ئەدیب هەبێ سەر بە حیزبێکی سیاسی بێو بتوانێ فیکرەکەی خۆی بەشێوەیەکی داهێنەرانە بخاتەڕوو . ناتوانین بڵێین ئەوەی پەیوەندی بەفیکرێکی دیارکراوەوە بکات ئیتر لە داهێنان دەکەوێ . ئەمەشیان پەیوەندی بەقووڵی ئەو شەخسەو باری ڕۆشنبیرییەوە هەیە ، هەروەها ڕادەی تێگەیشتنی لەدیاردەکانی ژیانو گیروگرفتەکانی مرۆڤ خۆی .

● **کاك فؤاد مجید گوتی** : ئەدەب سێ خاسیەتی سەرەکی هەیە ، هونەریش هەر ئاوا ، « یەکەم زانیاری دووەم ئایدیۆلۆژی ، سێیەم ئیستاتیکی » . کە ناوەڕۆك باس دەکەین دەبێ بزانین کە ناوەڕۆك بابەت نییە . بەڵکو چۆنیەتی چارەسەرکردنی بابەتێکە بەپێی تێڕوانینی ئایدیۆلۆژی نووسەرەکە . بو نموونە دیاردەیەکی دیارکراو لە کۆمەڵدا ، دکتۆر کاوسو محمد موکریو حەسەن جاف دەیکەن بەچیرۆك ، بەڵام هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی فیکری خۆیانەوە چارەسەری بابەتەکە دەکەن .. ئەمەیە مەسەلەی ئایدیۆلۆژی . ناوەڕۆك چییە ، زۆر جار ئێمە لە نووسینیشدا دەبینین ، هەندێ کەس دەڵێن بابەتو فۆرم لەجیاتی ئەوەی بڵێن ناوەڕۆكو فۆرم .. ناوەڕۆك شتێکە ، بابەت شتێکی کەیە .

بابەتێك دەیان نووسەر دەتوانن بەپێی تێروانینی فیکری خۆیان باسی بکەن ... کاك صلاح دەڵێ :
**« چیخۆف مەسەلەی فیکری رەتکردۆتەوە .. »**
ئێمە دەزانین چیخۆف کەلە نووسەرێکی واقیعی بووە . ئەوە گۆگۆل . بەڵام هەرچی لێکۆڵەرەوەی دونیا هەیە کە باسی چیخۆف دەکەن ، باسی عەبەسییەت لەبەرهەمیدا دەکەن ، بەر لەوەی عەبەسییەت وەك فیکر بێتەکایەوە ، رەگی عەبەسیەتی تیا بووە . کاك محمەد گوتی : دەبێ فیکرو ناوەرۆك جیابکەینەوە . ئەمە نابێ . فیکر مانای دەربڕینە . جا دەربڕین چۆن جیا دەکرێتەوە ، دوای ئەوە دەڵێ : لەناو ئەدەبەکەدا ئایدیۆلۆژیایەك دابنێین . چ ئایدیۆلۆژیایەك دابنێین **ئایدیۆلۆژیا مانای تێروانینی چینێکی دیارکراوی کۆمەڵە بۆ هەموو دیاردەکانی ژیانی ئابووریو سیاسیو هتد** . میللەتی ئێمەش وەکو هەموو میللەتانی تر هەر چینەی ئایدیۆلۆژییەتی خۆی هەیە . ئیتر ئایدیۆلۆژییەتی چی بۆ دابنێین ؟ بمانەوێو نەمانەوێ لە رێگەی ئەدەبەوە تەعبیر لەیەکێ لەو چینانە دەکەین کەلە کۆمەڵدا هەن .

مەسەلەی ئیلتزامیش . ئێمە هێشتا ئیلتیزامو ناچارکردن ( الزام )و چوونەریزەوە « انتماء » تێکەڵ دەکەین . چوونەریزی سیاسی شتێکە ، بەڵام ئیلتیزامی فیکری شتێکیترەو دەیان کەڵە نووسەر هەن هیچ ئیلتیزامی سیاسیشیان نەبووە کەچی بیانەوێو نەیانەوێ تەعبیریان لەباری سەرنجی حزبێکی سیاسی دیارکراو کردووە . هەروەها ئیلتیزام کردن بە فیکرەوە مانای ئەوە نیە قاڵبێك بۆ نووسینی نووسەر دابنرێ .

● **کاك رەئووف حەسەن** لەم رووەوە رای خۆی بەم شێوە دەربڕی : ئایدیۆلۆژییەت ئەوەندە شتێکی تەسكنیە کەبەس لایەنێکی بچکۆلەی ژیان بگرێتەوە . دەرخستنی فیکرێك لەلایەن نووسەرێکەوە پێویستی بە خوێندنەوەی زۆرو تاقیکردنەوەی زۆر هەیەو ئەزیەتێکی زۆریش دەکێشێ تاکو قەناعەتێکی فیکری دەهێنێو لەدوایدا زەحمەتێکی زۆر تر دەکێشێ تاکو تەعبیری لێدەکات ، بەڵام ئەوەی کە فیکر ناخاتە روو و چیرۆکەکەی بێفیکرە ، زۆر ئاسایی دەنووسێو هیچ ئەزیەتی ناوێو ئەمە شتێکی زۆر ساکارە ، ئەگەرچی چیرۆکنووس شتی هونەرکاریشی تیا بەکاربێنێ ! لە چیرۆکی « کونجی مامە تۆم » و « هێشوەکانی تووڕەیی »و « پاژنە ئاسنینەکان »دا زۆر هونەرمەندانە باسی ژیانی سەد تا سەدو پەنجا ساڵی ئەمەریکا کراوەو ئەم سێ چیرۆکە بوونەتە شاکاری جیهانی . لە رێگەی ئەم سێ چیرۆکەدا فیکری خۆشیان دەرخستووە ، سەردەمی کۆیلایەتی لە « **کونجی مامە تۆم** »دا بە جوانی باس دەکرێو نووسەر لایەنگیری کۆیلەکان دەکات . لە « **هێشوەکانی تووڕەیی** »دا لایەنگیری جووتیارە دەربەدەرەکان دەکرێ . لە « پاژنە ئاسنینەکان »دا باسی خەباتی کرێکاران دەکاتو پێشبینی سۆشیالیزم دەکات . ئەی لای ئێمە مەسەلەکە چۆنە ؟ دەبێ کاك « بێگەرد » لێم ببوورێ کە ـ مراد ـ ی پاڵەوانی ئەو چارەسەرەی ئێمە ناکات ! بەڵام بەلای منەوە « مەم » یان چیرۆکی « دڵداری قەدەغە نیە »ی مارف خەزنەدارو هەندێ چیرۆکی « کلاّفەیەك ژانی تووڕە »و چیرۆکەکەی رەحیمی قازیو هتد .
لەم نموونانە بەجوانی باسی ژیانی ئێرە دەکاتو

خوێنەری خۆشەویست ..
لەم بەشەدا پاشماوەی پرسیاری : ناوەرۆك یان عەبەست ؛ یان فیکر بۆ کورتە چیرۆکی کوردی پێویستە چیو چۆن بێت ؟ ـ ئایا پێویستە چیرۆکنووس هەر بەفیکرێك یان ئایدیۆلۆژییەتێك بێتو ئەوە لەبەرهەمەکەیدا رەنگبداتەوە بۆ ئەوەی ئەدیبی راستەقینە بێت ؟ یان هەر تەنها ئەوەندە بەسە ئەدیب بتوانێت ژیانی ئادەمیزاد دەرببڕێت ؟
ـ بڵاو دەکرێنەوە ئینجا دێینە سەر لێکۆڵینەوەی پرسیاری رەخنەی ئەدەبی لە ئەمە دەقی پرسیارەکەیە : رەخنەی ئەدەبی دەربارەی کورتە چیرۆکی کوردیو رەخنەگران ( نەك ئەدیبە رەخنە نووسەکان ) چ دەورێکیان لە پێشخستن یان پاشخستنی کورتە چیرۆکی کوردیدا هەیەو هەبووە ؟
ئیتر ئێوەو چۆنیەتی گفتوگۆو لێکۆڵینەوەی هەردوو پرسیارەکە .
ـ بەیان ـ

چارەسەری کێشە چینایەتی‌و نەتەوایەتی‌یەکانی میللەتەکەمان دەکات .

برادەران باسی فیکریان کرد . وا من دەڵێم ئەگەر برادەرێك تاقیکردنەوەیەکی زۆری هەبێ‌و بیەوێ بنووسێ ، ئەگەر فیکری نەبێ ئادەمیزاد نیە ، بەتایبەتی لە کۆمەڵگایەکی چینایەتی پڕ لە زەبرو زەنگ‌و گێچەڵ‌و رووداودا . یا ئەوەتا نووسەر پشتی چەوساوە دەگرێ ، یا پشتی چەوسێنەر . کاك محەمەد موکری دەڵێ فیکر لای من گرنگ نیە ، بەڵکو هونەرەکە گرنگە .. ئێ باشە ئەگەر وایە بۆ دەسکاری شانۆگەری – مردووەکان – دەکەی تاکو لەگەڵ فیکری خۆتا بگونجێ ، ئەگەر فیکرت بەلاوە گرنگ نیە ؟ کە دەسکاری دەکەی‌و فیکری خۆتی تێ‌دەخەی مانای ئەوەیە فیکرت لەلا گرنگە .

● دەربارەی رەخنەی ئەدەبی لەمەر کورتە چیرۆکی کوردی رەخنەگران گفتوگۆ کرا ، هەریەکە بەپێی بۆچوون‌و تێگەیشتن‌و ئاستی رۆشنبیری خۆی لە پرسیارەکە دواو قسەی‌کرد .

● لە پێشەوە **دکتۆر کاوس گوتی :**

هەموو میللەتان دەڵێن رەخنەگرمان نیە ، جا ئەگەر ئەوان وابڵێن دەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێ ؟

لای ئێمە هەتا ئێستا من نەمدیوە یەکێك هەبێ رەخنەگر بێ . برادەرێك هەیە زۆر حەزی لە چیرۆکەکانی من بوو ، رۆژێ لێم‌پرسی گوتم چیرۆکەکانت خوێندۆتەوە ؟ گوتی : نەخێر .

جا ئەم پرسیارە دووبارە دەکەمەوە ، ئایا رەخنەگرەکان بەرهەمەکانمان دەخوێننەوە یا لەسەر بنچینەی برادەرایەتی‌و رقەبەرایەتی فیکری‌و شەخسی رەخنە دەگرن ؟ ئەمەیە رەخنەی کوردی ؟

● **کاك محەمەد فەریق حەسەن گوتی :**

بەرای من ئەڵێم ئێمە کۆمەڵێ رۆشنبیرمان هەیە . دەتوانم ناویان بڵێم . هەردوو « فوئاد »و هەردوو « کەمال » ، لەگەڵ کاك « حوسێن عارف » ، رەخنەگری چیرۆك ئەمانەن . بەرای من بۆ شایەکی زۆر لە نێوانی چیرۆکنووسەکان‌و ئەم رەخنەگرانەدا هەیە . ئەم رەخنەگرانە خاوەنی رۆشنبیری‌یەکی بەرزن کەشان دەدەن لەشانی روشنبیرەکانی ئێستای رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، بەلگەشم ئەوەیە ، وتاری ئەم برادەرانە لە هەندێ گۆڤارو رۆژنامەی عەرەبیدا بلاوەبنەوە . بەڵام چیرۆکنووسەکان ئەو رۆشنبیری‌یەیان نیەو تەنیا پشت بە بەهرەی خۆیان دەبەستن ، لەبەر ئەم هۆیە چیرۆکنووسەکان‌و رەخنەگرەکان لەیەکتری ناگەن . چیرۆکنووسەکان هەست بەنامۆیی رۆشنبیری دەکەن‌و هەرچەند دەکەن ناگەنە رەخنەگرەکان ، لەبەر ئەوە دەڵێین رەخنەی کوردی نیە. **ئێمە ناتوانین بڵێین رەخنەی کوردی، چونکە رەخنە خاسیەتی نەتەوایەتی نیەو بریتی‌یە لە زانستو کەرەسەکەی بابەتی ئەدەبی‌و رۆشنبیری‌یە** . چۆن چیرۆکنووس بۆی هەیە هونەری چیرۆك لە رۆژئاواوە وەربگرێ ، هەروەها رەخنەگریش ئەوەی بۆ هەیە کە بە بابەتی رەخنەی رۆژئاوایی خۆی پێ رۆشنبیر بکات ، لەبەر ئەوەی کە رۆژئاواو ئەورووپا لە رەخنەو نووسینی ئەدەبی‌دا پێش ئێمە کەوتوون ، ئێمە ناچارین روو بکەینە ئەوان‌و سوود لە بەرهەمەکانیان وەربگرین ، چونکە رەخنە زانستە . رەخنەی ئەدەبیمان بەهێزە بەڵام چیرۆکی کوردیمان لەچاو ئەودا لاوازە ، من وەکو چیرۆکنووسێ زۆر سوودم لە رەخنەی ئەو رەخنەگرانە وەرگرتووە کە باسم کردوون .

● **کاك رەئووف حەسەن** بەم شێوە رەخنەی ئەدەبی هەڵسەنگاندو گوتی : ئەوانەی کە دەڵێن رەخنەی کوردیمان نیەو لە رۆژنامەو رادیۆدا بەچاوێکی سووکەوە باسی رەخنەی کوردی دەکەن ، کە چی نووسینی خۆیان ئەوەندە

کۆلەوارە تەنانەت زمانەکەشیان تەواوو ڕەوان نیە ، گڵو گڵ لێك جیاناکەنەوە ، کەچی تەسریحاتیان ئەوەندە زلە باسی ئەوە دەکەن کە ڕەخنەمان هیچ نیە ، خۆیان هیچ نینو هیچ شتێکیان نەبووەو ناتوانن بەتەواوی کوردی بخوێننەوە . مەسەلەی ڕەخنەی نەتەوایەتیش کە کاك محمەد فەریق حەسەن باسی کرد لەگەڵی رام کە ڕەخنە نەتەوایەتی نیە . بەتاقی تەنیا شیعرو چیرۆکو پەخشانی نەتەوایەتی هەیەو ئەم زاراوە کە هاتە کایەوە بۆ ئەوەبوو بەربەرەکانی ئەو ڕەخنەگرانەمان بکەن کە هەمانە . زۆربەی چیرۆکنووسانمان دان بەوەدا دەنێن کە ڕەخنەگرانمان لە چیرۆکنووسانمان ڕۆشنبیر ترن . سەبارەت بەخۆمانەوە ڕەخنەگرانمان لەپێشخستنی چیرۆکی کورتماندا دەوریان هەبووەو هەیە .

● **کاك محمەد موکری گوتی** : چۆن بەم شێوەیە باسی ڕەخنە دەکرێ . سەیری کەلەپووری نەتەوایەتیمان بکەن لە ئەدەبو شیعرو چیرۆکەوە، دە وتاری ڕەخنەمان نیە ، ئەوەی کە هەمانە نەك تەنها هانی نووسەری نەداوە خۆی پێشخا ، بەڵکو چاڵێکی بۆ نووسەر هەڵکەندووەو خستوویەتی‌یە بارێکەوە نەتوانێ چاو بەخۆیدا بخشێنێ . کوا چ ڕەخنەگرێ توانیویەتی لەتوێی نووسینی نووسەرێکەوە خەڵقێکی تر بکات تەنها ئەوەندەیە . دەڵێ ئەو چیرۆکە باشەو ئەوە خراپە . ئەویش بەپێی بیروباوەڕو ئایدیۆلۆژییەتی خۆی ، ئەمەکەی ڕەخنەیە ؟! ڕەخنەی چی ؟! ڕەخنە لەچی ؟! ..

● باشان **کاك اسماعیل رسول** کۆتایی بە گفتوگۆیەکە هێناو بۆ چوونی خۆی بەرامبەر ڕەخنەی کوردی ئاوا دەربڕی بابەتی ڕەخنە زۆر کۆنەو ئەوەی بیەوێ شارەزای ڕەخنەی ئەدەبی بێ ، دەبێ بەلانی کەمەوە بگەڕێتەوە بۆ سەر سەد سەرچاوەی ڕەخنەسازیو زیاتریش ، واتە لە ئەدەبی عەرەبیو بێگانە بە فراوانی بکۆڵێتەوە .

پێش باسی ڕەخنەش دەڵێم بابەتی دەمەتەقێ نابێ گفتوگۆی شەخسی تیا بێتە کایەوە . مەبەست لەم دانیشتنەش خستنەڕووی بابەتی شەخسی نیە ، بەڵکو مەبەست هەندێ مەسەلەی گشتی‌یە .

بەڕاستی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی پەیوەندی بە ئەدەبەکە خۆیەوە هەیە ، وەکو باسمان کرد ماوەیەکی زۆر کورتە جووڵانەوەی تێکەوتووە . ڕەخنەی ئەدەبیش لە ئەدەبی کوردی‌دا تازەیە .

بابڵێین لەگەلاوێژەوە تاکو تووك وتاری ڕەخنەسازی دەخوێنینەوە ، ئەویش دەربارەی شیعرە ، چونکە ئەو وەختە تازە دەستکرابوو بەوەرگێڕانی چیرۆکی بێگانە بەڵام فعلاً ئەم ساڵانەی دوایی بزوتنەوەی ڕەخنەسازی پەیدا بوو . بەڵام ناتوانین بڵێین ڕەخنەگری شارەزاو بەپێزمان هەیە . بەڵێ هەوڵو تەقەلاو نووسەری چاك هەن کە خۆیان ماندوو دەکەنو دەنووسن ، بەڵام چەند تیادا سەرکەوتوونو چەند مەوزووعین ئەوە باسێکی‌ترە وەکو دکتۆر کاوس گوتی بابەتی ڕەخنەی ئەدەبی خۆی لە تەنگو چەڵەمەدایە ، نەك تەنیا لای ئێمەی کورد ، بەڵکو لە ئاستی هەموو عیراقدا . هۆیەکانیشی وەکو برادەران دەستنیشانیان کرد زۆرە . **ڕەخنەی ئەدەبی زانستێکە دەبێ ئەو کەسە شارەزای تەواوی تیا هەبێو پەیوەندی بەگەڵێ شتەوە هەیە ، بە ئاستی ڕۆشنبیری‌ی ئەوکەسەو بەشارەزابوونی لە ئەدەبیاتی جیهانیو ڕێبازەکانی فیکر لەجیهاندا** . هەروەها مەسەلەی هونەریش زۆربەی ڕەخنەگرەکانی مەسەلەی شەخسی تەسك کاری‌تێکردوون . بەشێکی زۆریشیان خۆیان چیرۆکنووسنو ڕێبازێکی دیارکراویان هەیەو دەیانەوێ هەموو خەڵکەکە وەکو خۆیان بنووسن ، ئەگەر وا نەنووسن بە چیرۆکیان نازانن . یاخود هەندێ جار چیرۆکنووسیش زوو هەڵدەچێو لە ئاستی ڕەخنەدا سنگی واڵا نیە .

بەرای من پێویستە ئێمە باسی ئەوە بکەین کە دیاردەی سەلبی لە ڕەخنەی کوردی‌دا چیەو ، پەیوەندی لەنێوان چیرۆکنووسو ڕەخنەگردا چیەو چەند لە یەکتردەگەن ؟

— ماویەتی —

تۆمارێکی تایبەتی دەربارەی :

# کۆڕی شیعری نوێی کوردی

ئامادەکردنی : صلاح شوان

## پێشەکی :

● لە سێ ژمارەی ڕابوردووی گۆڤاری «بەیان»دا بیروڕاو گفتوگۆی مامۆستایان بەشدارانی کۆڕە خنجیلانەکەی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردیمان کە دەربارەی شیعری نوێی کوردی سازکرابوو ، لەسەر سێ پرسیاری یەکەم بۆ خوێنەری بەڕێز بڵاوکردەوە .

وا لەم ژمارەیەشدا بەشێکی تری ئەو کۆڕەتان پێشکەش ئەکەین کە بریتییە لە ڕاو گفتوگۆی بەشدارانی بەڕێز دەربارەی پرسیاری چوارەمی کۆڕەکە ●

پرسیاری چوارەمی کۆڕەکەیش هەر لە دووەم دانیشتنی ڕۆژی یەکەمی کۆڕەکەدا خرایەڕوو . کە هەر مامۆستا « ع . ع . شەونم » هەڵی دەسووڕاند ..

● **ع . ع . شەونم :**

ئیستا بێینە سەر پرسیاری چوارەم کە دەڵێت :

● **شیعر لە نێوان بەهرەو شیعر سازیدا چۆن هاوسەنگیی خۆی دەپارێزێت ؟**

واتە شیعر لە نێوان سەلیقەی شیعریی شاعیرو ، سنعەت‌و پێداچوونەوەی شاعیردا بۆ ئەوەی وردەکاریی هونەری شیعری بخاتەسەر ، بۆ نموونە شاعیری وامان هەیە خوێندەوار نەبووە ، جا ئایا تەنها بەهرەی شاعیرەکە بەسە بۆ ئەوەی یەکێك شیعر دابنێت . یان پێویست بەوەش دەکات شاعیر شارەزای دارشتنی هونەرییانەی شیعریش بێت‌و ئەو شارەزاییەش لە بەرهەمەکانیدا بنوێنێ ؟!

● **کەمال غەمبار :**

بەر لە هەموو شتێك ئێمە دان بەوەدا

دەنێین کە شیعر بەهرەیە ، هەر کەسێك ئەو بەهرەیەی تیا نەبێت چەند رۆشنبیریەکی فراوانیشی هەبێت هەر نابێ بە شاعیر . بەڵام بەهرەکەش هەموو شتێك نییەو ، پێویستی بە وەستایەتی رۆشنبیریی فراوانو هونەرمەندی هەیە . بەهرە واتە عەفەویەتی شاعیر کە ئەمە بناغە سەرەکییەی شیعرەو دەبێت شیعر سازیشی لەگەڵدابێت . بۆ نموونە رایەکی « شوقی ضیف » ئەهێنمەوە کە باسی گەورەترین شاعیری جاهیلیی عەرەب دەکات کە « امرؤ القیس »ـە دەربارەی بەیتە شیعرێکی کە وتویە :

**وقد اغتدي والطیر في وکناتها**
**بمنجرد قید الاوابد هیکل**

ئەو رەخنەگرە دەڵێت ئەم شاعیرە وشەی « قید الاوابد »ی هەروا لە خۆیەوە نەهێناوەو لە خەڵکی تریشیەوە وەرنەگرتووە ، بەڵکو لە ئەنجامی ئەندێشەو لێوردبوونەوەیەکی زۆرەوە گەیشتووە بەو وشەیە ، واتە دیارە چەند جارێك بە شیعرەکەیدا چووەتەوەو لێکیداوەتەوە تا لە ئەنجامدا ئەو وشە پڕ بە پێستەی بۆ دۆزیتەوە . بۆیە پێویستە شاعیر سەرەرای بەهرەکەی رۆشنبیریەکی چاکیشی هەبێت بۆ ئەوەی چی زیادە لێی لاببات و چی کەمەو پێویستە بۆ گەیاندنی هەستو سۆزو مەبەستەکەی بە خەڵکی بیخاتە سەرو بە پێی پێویستو بە چاوێکی

رەخنەگرانەوە کەمو زیادو گۆڕین لە شیعرەکەیدا بکات پێش ئەوەی بیخاتە بەرچاو خەڵکی .

ئینجا چەند ئەم دوو لایەنەی شیعر : بەهرەو شیعر سازی لە لای شاعیر پێشکەوتوو بەهێزبن ئەوەندە شیعرەکانیشی سەرکەوتوو دەبنو بە نەبوونی لایەکیان هاوسەنگیی شیعرەکە لەدەست دەچێتو شاعیر ناتوانێ بەرهەمێکی پوختمان پێشکەش بکات ، زوربەی شاعیرە مەزنەکانیشمان لەگەڵ گشت شاعیرە مەزنەکانی جیهاندا بە وردی ئەم دوو لایەنەیان رەچاوکردووەو هاوسەنگییان لە نێوانیاندا کردووە .

● **شێرکۆ بێکەس :**

بە رای من بەهرە بەردی بناغەی شاعیرە ، بەڵام بەهرەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازیی و کەمو زۆری هەیەو بەهرەی هیچ شاعیرێك رێك وەك شاعیرێکی تر نییە . جگە لەمەیش بەهرە خۆی پێویستی بە پەروەردەکردنو گەشەپێدان هەیە ، بێجگە لە مەسەلەی رۆشنبیریی شاعیر کە کاك « کەمال غەمبار » باسی کرد ، مەسەلەیەکی تریش هەیە کە :

تاقیکردنەوەیە . تاقیکردنەوەی شاعیر لە ژیانی خۆیدا ، کە خوێندنەوەش دەبێت بە بەشێك لەو تاقیکردنەوانەی ژیانی شاعیر . ئینجا شاعیر بۆ ئەوەی بەهرە سروشتییەکەی خۆی پەروەردە بکاتو بیخەملێنێت پێویستی بە بەردەوام بوونو نەپچڕانە لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانیدا ، چونکە شاعیر تا زۆرتر بەردەوامیی و خۆخەریککردنو پراکیتکی شیعری هەبێت زیاتر دەتوانێت پەیوەندییەکی نەپچڕاو لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی خۆیو لەگەڵ خوێنەریشدا دروستبکات ، کە ئەمەیش جۆرێکە لە شیعر سازی .

بۆ وردبوونەوەو تەتەڵەکردنی بەرهەمی شیعریش لای شاعیر من ئەو شێوە نووسینەی « پۆشکین »م دێتە یاد کە وتراوە بۆ بەکارهێنانی وشەیەك چەند مورادیفی ئەو وشەیەی خستۆتە پێش چاوی خۆی ئەنجا یەکێکیانی هەڵبژاردووە ، ئەم مەسەلەی بژارکردنە لە وشەدا لایەکە لە شیعر سازی بە گشتی بۆ ئەوەی شاعیر بزانێت چ وشەیەك یان رستەیەك یان وێنە شیعرێك لەوانیتر زیاتر بۆ ئەم شوێن یان ئەویتر دەستدەدات .

مۆنتاجیش لایەنێکی تری شیعر سازییەو شاعیری هاوچەرخ زۆر پێویستیی پێی هەیە ، بۆ ئەوەی شتە زیادەکانی لێ لابەرێتو بە جۆرێکی وەها رستەو بڕگەو وێنەو دەربڕینەکانی بەیەکەوە بەستێتەوە کە لەگەڵ ئەوانی تردا بگونجێتو بینا شیعرییەکەی بە گشتی وا دابرێژێت کە یەکێتیی بابەتی تیابێت .

بەگشتیش ئەڵێم : بەهرە هەیە بەڵام نیسبیەتیش لە بەهرەدا هەیە ، ئەمە یەك . دووەمیش : رۆشنبیریی شاعیر بە تەنها ئەوەندە بایەخی نییە ، ئەگەر ئەو رۆشنبیریە تاقیکردنەوەی لەگەڵدا نەبێت ، بۆ ئەوەی شاعیر بتوانێت لە کاری شیعر سازیدا سوودی لێوەربگرێت . ◁

سێیەمیش : مەسەلەی بەردەوامیو تەواســـــول لەگەڵ شیعرداو ، مۆنتاج کردنی شیعر .

● **عبدالرزاق بیمار :**

خۆی وشەی « شیعر » وەکو زۆر شاعیر وتوویەو زۆری تریش ئەو رایەیان پەسەندکردووە، ئەوەیە لە « شـــعور »ەوە هاتووە ، واتـــە سەرچاوەکەی هەستو سۆزی شـــاعیرەکەیە ، بەڵام لەو رایەش زانستیانەتر ئەوەیە دەبێ بوترێ لایەنە فیکرییەکەیش سەرباری ئەو لایەنەی پێشوو بێت . لەمەوە دەڵێم شـــیعر دەبێ تەنها بەهرە نەبێ . بەڵام ئەی بەهرە خۆی چییە ؟! خۆ ئەگەر خەیاڵ یان سۆز یان ئەو حاڵەتە ئامادیە دەروونییە بێت کە شـاعیر دەتوانێ شـیعری تیـا بڵێت ، ئەمەش دیسان لە واقیعو دەوروبەری شاعیرەکە دەرناچێت . کە وا بوو ئیلهام نییە . بەو مانایەی

کە لە جیهانێکی ترەوە گشت شیعرەکە بە فیکرو وەزنو مۆسیقاو رۆشنبیرییەکەیەوە بۆ شـــاعیر دابەزی بێت ، نەخێر . بەڵام دەبێ شـــــاعیر

بەهرەیەکی شـــــیعر دانانی هــەبێتو فیـکرو رۆشنبیریی خۆیشی تێکەڵ بەو توانـایـە بکات بۆ ئەوەی شیعری سەرکەوتوو دابنێت .

● **شوکوور مستەفا :**

بەهرەی شـــاعیرێتی شتێك نییە وەك بڵێین ئەو کەسە هەر بۆ شاعیرێتی خولقابێ ، یان وەکو « کرۆمۆسۆمات » لە لەشیدا ئەو سیفاتەی تیابێ ،

بەڵکو تواناو ئامادەبوونی کەسێکە بۆ شیعر دانان کە جیاوازیی هەیـە لەگـەڵ ئەوانی تـردا ، خەڵـکی تریش بەهرەی لە شتی‌تردا هەیە ، کـە زیاتریش ئادەمیزاد لە تاقیکردنەوەی ژیـانو باری تایبەتیی ناوەوەو دەرەوەی خۆیەوە دەستی دەخات ، کـە

دەڵێین ئەم شاعیرە بەهرەی هەیە ئەوە نییـە لـە شانەکانی لەشیدا شـــتێکی وەها هەبێت ، بەڵکو توانایەکـەو پێویستی بـە پەرەپێدانو پێشخستن هەیەو . شاعیریش وەکو گشت بەهرەمەندانی تر نەبێ لە ژیانی خۆیەوە بەرهەمەکەی پەرەپێبدات .

● **صەلاح شـوان :**

ئەوەی تا ئیستا برادەران باسـیان کرد بـە گشتی ئەوەیە ، یەکەم شاعیر بەهرەی شـــیعر دانانی هەبێتو ئینجا رۆشنبیرییەکی فراوانیشـی هەبێت ، ســـــوودی لە تاقیکردنەوەکانی ژیـانو تاقیکردنەوە هـونـەرییـەکانیش وەرگرتووبێت .

ئەمانە راستن ، بەڵام هەموو شـــتێکیش نین بۆ ئەوەی شاعیرێك بتوانێت شیعرێکی سەرکەوتوو بڵێت . زۆر جار شاعیر پاش ئەوەی گشـت ئەو شتانەشی لەلا دەخەملێت ئینجا لە شـــیعر وتن ئەکەوێت ، یان شیعری سەرنەکەوتوو دائەنێت ،

یان بە پێچەوانەشەوە شـــاعیری وا هەیە چ بـە تەمەنو چ بە تاقیکردنەوەی ژیان ئـەوەی بۆ نەرەخساوە وەکو زۆریتر تەواو خۆی پەروەردە بکات کەچی گشت ئەوانی تریشی° رەتکـردووە ،

وەکـو « رامبـۆ » . « بۆدلێر »یش نزیکەی پانزە بیست ســـاڵێکی کۆتـایی تەمەنی هەر خەریکی پێداچوونەوەو چاکردنەوەی شیعرەکانی پێشووی خۆی بووە ، « گۆران » شیعرەکانی هەموو وەکـو یەك سەرکەوتوو نینو بە راستە رێیەکدا بـەرەو ژوور نەرۆیشتووە . رەنگە ئەمانە هەر یەکە بارو دۆخی تایبەتیی خۆیو هی شـیعرەکەیش دەوری لەم سەرکەوتنو ژێرکەوتنانەدا گێرابێت ، چونکە رای گشتی زۆر جار شـــتی وردی گرنگی تیـــا لەناونەبرێت . ئێمەیش تا ئیستا زیاتر هەر باسی لایەنە گشتییەکان دەکەین .

بۆ مەسەلەی بەهرەکـە ، « ئەلیۆت » کـە زیاتر پێ لەسەر مەوزووعییەتی شیعر دادەگرێت ،

دەڵێت شـــیعرەکانی لـــە ئەنجامی کـۆششو خۆماندووکردنەوەیەو بەهـرە هیچ دەورێکی تیـا نەبینیوە ، بە پێچەوانەی « رامبۆ » وە کـــە لـە دوو سێ ساڵێکی هەرزەکاریدا ئەو شـــیعرانەی داناوەو ئیتر هەر بە لای شـیعردا نەچووەتەوە ،

« ئەزرا پاوەند » خۆی شـــاعیر نەبووەو کەچی دەستکارییەکی زۆری شیعرەکانی شاعیرانی وەك « ئەلیۆت »و « سان جۆن بیرس »ی کردووەو ، لە سەردەمەکەی خۆیدا بە « الصانع الامهر » لـە ئەدەبدا ناوبراوە .

•

بە کورتی مەبەستم ئەوەیە ســـــەرەرای

بەهرەی شاعیرو رۆشـــــنبیرییە فراوانـەکـەیو تاقیکردنـەوەیـەکی زینـدووی ژیـانو هونــەرە ئەدەبیەکان ، هەر شاعیرەو هەر شــــیعرەش کۆمەڵێك هەڵو مەرجی بۆ دەرەخســـێت بۆیە دەبێت بە شــــیعرێکی سەرکەوتوو ، بەڵام هەمان ئەو هەڵو مەرجانە بۆ شاعیرێکی تر ، یان تەنانەت بۆ شیعرێکی تریش بڕەخســــــێت مەرجَ نییە شیعرێکی سەرکەوتووی لێبێتەکایەوە ، بەڵام ئەمە هەرگیز ئەوەش ناگەیەنێت شاعیر شــــیعرەکانی بداتە دەســـــت رێکەوتو چۆنی بۆ هات وای دابنێت ، چونکە هەوڵو کۆششی شـــــــاعیرو خۆماندووکردنی بە شیعرەوە هــەر جێگای رێزەو بە گشت بارێکیش شاعیری دڵسۆز بۆ شیعرەکانی لە شاعیری هەڕەمەکی زیاتر جێگای رێزە .

● **حەسیب قەرەداغی :**

بەهرە ژیان دروســـــتی ئەکاتو پەروەردەی ئەکات ، شاعیری وا هەیە بە بەهرە شــاعیر نییە کەچی شـــــیعری زۆر نایابیش دائەنێت ، زۆر بەهرەیش هەیە خاوەنەکەی نـاتوانێ پــەروەردەی بکاتو گەشەی پێبدا .

بەڵام بۆ ئەم دوو لایەنی بەهرەو شـــــیعر سازییە من « د. شۆ » ئەهێنمەوە کە شــەسـت ساڵ پێش نیـستا شیعریم دیوە لە شــــــیعرە کلاسیکییەکانی ئەوانیتر کەمتر نەبووە لـە رووی بەهرەوە ، بۆ شیعر سازیش نیـــــستایش ئەگەر دابنیشێ بە ســــەدان قافیەی رێکوپێك ئەنێتە سەریەك . جا راســـــتە بەهرە هــەیـە ، بەڵام دینامیکییەتی ژیانو رۆشنبیری گەشەیپێئەدا .

● **کاکەی فەلاح :**

« گۆران » دەربارەی بەهــرە جارێکیان بــە منی وت : ئەگەر لە کەسێکی سادەو ســـاویلکە بپرســـێت لەم فەرشەدا چ رەنگێکیان جوانترە ؟ یەکسەر پەنجە ئەخاتە سەر سوورەکەی ، چونکە لە هەموویان زەقترە ، بەڵام ئەگەر لە من بپرسی پەنجە ئەخەمە سەر ئەو رەنگەی کە سەرنجی کەم کەس رائەکێشێت .

بەهرە بە جۆرەها شـــێوە لێکدراوەتەوە ، بەڵام بە باوەڕی من لە خەیاڵێکی وردو هەستێکی ناسـكو چاوێکی تیژو چێژێکی بەرزو ، زمانێکی رەوانو سووتان لەگەڵ وشەداو خۆشەویستی بۆ گەلو مرۆڤایەتیو ئادەمیزادی چەوســــــــاوەو هەڵویست نواندنو زۆر شتی تریش پێکهاتووە .

بەڵام بەهرە بەردەوامیو پێشخستنی ئەوێو شاعیریتی بە میرات بۆکەس نامێنێتەوە ، دەورو بەریش کارێکی ئەوتۆێ لە دروستکردنی شاعیردا نییە ، دەوروبەری لێکچوو شاعیری لێك جیاواز دەهێنێتە کایەوە ، وەك چۆن یەك شاعیر شیعری جیاواز دائەنێ .

● **عەبدوڵڵا عەباس :**

کۆڕەکـەمان کـۆڕی شـــــــیعری نوێی « کوردی »یەو کەچی برادەران ــ بە تایبەتی کاك صـــلاح شـــوانو کاك نەوزاد رفعەت ــ هەموو نموونەکانیان شـــــاعیرانی بێگانەبوون ، گوایـە شیعری کوردی لە کۆنو نوێشـــــدا بنەرەتی خۆماڵیی نییە تا ئێمە بتوانین بە بەڵگە بهێنینەوە گفتوگۆی لەسەر بکەین ؟

● **نەوزاد رفعەت .**

دەربارەی ســــــەرنجەکەی کاك « عەبدوڵڵا عەباس » دەڵێم : بەڵێ شـــیعرو شـــاعیری مەزنیشمان هەیە بشێین بە نموونە بیانهێنینەوە ، بەڵام بە داخەوە رەخنەگری مـەزنو مونـەزیـری وەکو ئەوانمان نییە تا پشت بە لێکدانەوەو بیـرو رایەکانیان ببەستین ، جا من بەلامەوە پەسەندترە رای رەخنەگرێکی مەزن بهێنمەوە بـا بێـگانەیش بێت وەك لەوەی رایەکی ســــــەرپێی خۆم یـان یەکێکیتر بهێنمەوە .

**ماوێتی**

**● زانستی ئاوەڵواتا « لە ڕەخنەسازیی یۆنانیو ڕۆمانیو عەرەبیو ئەوروپیـیەوە بۆ ڕەخنەسازیی کوردی ..**

ئەم کتێبە دکتۆر کامل حسن عزیز البصیر دایناوە . لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق لە چاپ دراوە . بریتی‌یە لە پێشەکیو چوار بەشو کورتەیێك لە باسەکە بەزمانی عەرەبی . لە پێشەکی‌یەکەدا دەڵێ : ووشە لە ڕووی ژمارەوە لە هەموو زمانێکدا سنووری هەیەو لە بن دێت ، بە پێچەوانەی واتاوە کە هەرگیزاو هەرگیز کۆتایی نایەتو هەمیشە لە پەرەسەندندایە . ئەم ڕاستی‌یە وای لە میللەتان کردووە هەندێ ووشە لە زمانەکانیاندا بۆ دوو واتا یان زیاتر بەکاربهێنن . دکتۆر البصیر پەنجە بۆ ئەوە درێژ دەکات کە ئەوانەی لە زمانی کوردی خۆیان لە قەرەی ئەم بابەتەداوە شوێن پێی شارەزا عەرەبەکانیان هەڵگرتووەو ئەو چەشنە ووشانەیان ناونـاوە خوازەیان خواستە . دانەر لە ڕوانگەی ئەوەی کە زاراوەی ئاوەڵواتا لە نێوانی زانستیو زمانو ڕەخنەسازیدا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی هەیە ڕێبازێك بۆ خۆی تەرخان‌دەکاتو لەسەری دەڕواتو باسەکەی دەکات بە چوار بەشەوە بەشی یەکەم تێ ڕوانینێکی گشتی‌یە دەربارەی میتەفۆر لەڕەخنەسازیی یۆنانیو ڕۆمانیدا .

بەشی دووەم سەرنجێکە لە ڕەخنەسازیی عەرەبی بۆ دەستنیشان کردنی چۆنیەتی باسی مەجاز لە لایەن زاناکانی ڕەوانبێژی عەرەبی‌یەوە .

بەشی سێیەم پیاچوونەوەیەکە لەگەڵ چەند ڕەخنە سازێکی ئەوروپی هاوچەرخ بۆ دەستنیشان کردنی گۆڕانەکانی باسی میتەفۆر لەسەر دەمی دێرینەوە هەتاکو ڕۆژگاری ئێستەمان .

بەشی چوارەم لێکدانەوەی باسی « خوازە »یە لەلای ئەو زانا کوردانە کەلەم باسەدا ئیشیان کردووە لەگەڵ چەسپاندنی بیرو ڕا تایبەتیەکانماندا لەم ڕووەوە .

ئەوی بەلای ئێمەوە گرنگە بەشی چوارەمە کەلە خوازە لە ڕەخنەسازیی کوردی‌دا دەدوێتو دێتە سەر ئەو مامۆستا کوردانەی کە لە خوازەو مەجاز دواون وەك « علاء الدين سجادی » عەزیز گەردی ، « دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف » باسی بۆ چوون هەر سێکیان دەکات کە چۆن لەبابەتەکە گەیشتوون ، ئینجا سەرەنجە تایبەتی‌یەکانی خۆی دەخاتە بەرچاو . کە باسی بۆ چوونەکانی مامۆستا سجادی دەکات ، دەگاتە ئەو قەناعەتە کە باسی خوازە لەلای ئەو دەنگ دانەوەیەکی باسە ڕەوانبێژی‌یە عەرەبیەکانی سەردەمە دواکەوتووەکانەو هیچ بە پەیوەندی‌یەکی هونەریو زانستی بەسروشتی ئەم دیاردە زمانیو هونەریەوە لە زمانی کوردیدا نیە . لە کتێبەکەی مامۆستا گەردی « ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا » دەکۆڵێتەوەو پێ بە پێ بۆ چوونەکانی دەخاتە بەر ڕووناکی بۆ چوونی خۆیو ڕەخنەیان لێ دەگرێ . کە ئەویش شوێن پێی مامۆستای سەردەمە دواکەوتووەکانی ڕەوانبێژی عەرەبی هەڵگرتووەو ئاگای لە کتێبە ڕەخنەسازی‌یە عەرەبی‌یە هاوچەرخەکانمان نییە ، وەکو کتێبەکانی « امين الخولی » و « دکتور محمد مندور »و « احمد امين »و « فؤاد الشايب » . هەروەها هیچ جۆرە پەیوەندیەکی زانستیانەی لەگەڵ ڕێبازە ڕەخنە سازیەکانی ئەم مامۆستایانە نەبەستووە . دانەر ڕای ئەوەیە کە نرخی ئیشەکەی مامۆستا گەردی لەوە دەرناچێ کە توانیویەتی بە زمانێکی ڕەوانو هێنانی نموونە لە وێژەی کوردیەوە زۆربەی بابەتەکانی زانستی بەیانی عەرەبی وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی . لە باسی مەجاز لەلایەن دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارفەوە دەکۆڵێتەوەو ڕایەکانی دەخاتە بەردەم خوێنەرو ئەویش وا دەداتە قەڵەم کە باسی

ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان
ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان
ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان
ئاسۆگەی ڕۆشنبیریی بەیان




مەجازی واکردووە کە هەنگاوێك بەرەو پێشەوە نیەو لە ریزی هەنگاوەکانی مامۆستا سجادیو گەردی دان . دوا بەدوای شیکردنەوە نووسینەکانی مامۆستایانی ناو براو ، باسی سیماتێكو ئاوەڵواتا چەشنەکانی ئاوەڵواتا دەکۆلێتەوە وەك « ئاوەڵواتای فەرهەنگیو هونەری » .

لە ڕاستیدا لێکۆلینەوەی ئاوا هەنگاوێکی بەرەوپێشەوە چوونە ، چونکە دانەر نەهاتووە جێ پێیی مامۆستاکانی پێشووی هەڵنەگرتووەو ڕێبازێکی دی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو هەنگاوەی دکتۆر کامل هێشتا لەو ئاستەدا نیە کە ڕەوانبێژیی کوردی بە تایبەتی بابەتی خواستنەوەو مەجاز گەرەکییانە. چونکە شیعری نوێی کوردی ، ئەمرۆکە گۆرانێکی گەورەی بە خۆیەوە دیوەو چەند هەنگاوێك بەرەوپێشەوە چووە ، دەبوایە دکتۆر البصیر ئاورێکی لە هۆنراوەکانی شێرکو بێکەسو لەتیف هەڵمەتو ئەنوەر جافو شاعیرانی دی بدیابایەوەو چەند نموونەیەك لەو هۆنراوانەی شیکردبایەوە ، بۆ ئەوەی خوێنەر لەبەردەم دەرگایەکی نوێیی دی خۆی بەدی کردبا کە هۆنراوەی ئەو شاعیرانە دەرگایەکی دی بو « استعارەو مجاز »ی کوردی کردەوە بەجۆری قالبی کۆنیان تێكو پێك شکاندو بابەتی تازەیان هێنایە ناو ڕەوانبێژیی کوردییەوە .

**● شانۆنامەی « دوژمنان »و بەرەو سایکۆلۆژیی بزوتنەوەی کرێکاران لە بارەی ( دوژمنان )ی مەکسیم گۆرکییەوە .**

شانۆنامەی دوژمنان نووسینی مەکسیم گۆرکییە . دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف لە ڕووسییەوە کردوویە بە کوردیو کاکە حەمەی مەلا کریم پیاچوەتەوەو دایرشتوەتەوە .

بەرەو سایکۆلۆژیی بزوتنەوەی کرێکاران لە بارەی « دوژمنان »ی مەکسیم گۆرکیەوە . نووسینی « گ. ف » پلیخانوف ، کاکە حەمەی مەلا کریم لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی . ئەم دوو نووسینە لە تۆویی بەرگێکی ڕێکوپێکدا کراون بە کتێبێك . لە چاپخانەی « دار العراق للطبع والنشر » جریدة العراق ـ لە چاپ دراون .

ئەوەی کەشیاوی باسە دکتۆر ئەورەحمان واماوەیەکە خەرێکی وەرگێڕانی بابەتی ئەدەبییە لە زمانی ڕووسییەوە . ئەم هەنگاوەش مایەی خۆشبەختییەو جێگەی باوەڕو مونمانییە کە وەرگێڕ خۆی شارەزای زمانی ڕووسییەو بەوردیو هەناسەیەکی درێژ دەسدەداتە وەرگێڕانو شەونخوونی بۆ دەکات . وەرگێڕانیش لە زمانە ئەسلییەکەو لەلایەن وەرگێڕێکی لێ هاتووەوە هەنگاوێکی بە جێیە ، وەکە نووسەرێکی وەك کاکە حەمەش بە وەرگێڕانەکە دادەچێتەوەو دایدەرێژێتەوە زیاتر نرخو بەها بە وەرگێڕانەکە دەدات جێگیرتری دەکات ، ئەم هەنگاوەش لە جێگەی خۆیەتی . بەڕاستی ئێمەی کورد لەپێش هەموو شتێكدا جارێ پێویستیمان

به وەرگێڕانە بە تایبەتی شاکاری ئەدەبی جیهانی ، چونکە ئێمە لە چاو گەلانی پێشکەوتوودا تابڵێی دواکەوتوو و بەجێ ماوین . وەکە کاکە حەمە هاتووە لێکۆڵینەوەکەی پلیخانۆفی کردووە بەکوردی ئەویش خزمەتێکی باشی کردووەو سوودێکی گەورە بە خوێنەر دەگەیێنێ کە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەکەدا بەناو شانۆنامەکەدا شۆڕبێتەوەو بزانی کە چۆن ڕوونـاکی خراوەتە سەرو ئەو ڕووە سایکۆلۆژیە چیە کە ڕەخنەگری بەناوبانگ پلیخانۆف لە شانۆنامەکەدا هەڵهێنجاوە. ئەوەندە بەسە کە خوێنەر لەوە بگات وەك پلیخانۆف دەڵێ : « هونەرمەند ڕۆژنامە نووس نیە . هونەرمەند حوکم بەسەر شتدا نادا ، بەڵکو وێنەی شت ئەگرێ . ئەو هونەرمەندەی دی خەباتی چینایەتیمان بۆ ئەخاتە بەرچاو ، پێویستە لە سەری ئەو ئامادەبوونە دەروونیەیشمان بۆ دەربخا کە ئەم کێشەیە لە قارەمانانی شانۆ نامەکەیدا دروستی ئەکا . ئەبێ ئەو چۆنیەتییەمان پێشانبدا کە بیرو سۆزی قارەمانەکانی خۆیی پێ دیاری ئەکات . بە کورتی هونەرمەندیوا ، پێویستە زانای سایکۆلۆژی بێ .

بە داخەوە ئەم شانۆگەریە مەزنەو بەو وەرگێڕانە نایابەیەوە خۆی لە بەرگێکی وادا نابینێتەوە کە مایەی چاو ڕۆشن کردنەوە بێ . جارێ پیتی چاپەکە وردەو لەسەر کاغەزیکی بۆرە ، دەبوایە ئەرکی لە چاپدانی بکەوێتە سەر شانی دەزگایەکی کوردی ، هەروەها لێکۆڵینەوەکەی پلیخانۆفیش هەروەها شیاوی ئەوەنیە لەسەر کاغەزێکی ئاوا بۆرو هەرزان بەها بێ . ئومێدە وارین لە بەرهەمی داهاتوودا ئەم کەلەبەرە چارەسەربکرێ‌و ، دکتۆر ئەورەحمانو کاکە حەمە بێ وچان بەرهەمی ئەدەبی گەلانمان بۆ وەربگێڕنە سەر زمانی کوردی .

## ● دیلان شاعیرو ئازادیخواز :

لە نووسینی دڵشاد عەلی نامیلکەیەك بەناوی « دیلان شاعیرو ئازادیخواز » دەرچوو ، کە لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق چاپکراوە . نووسینی ئەم نامیلکەیە بریتییە : لە پێشەکی‌و هەڵسەنگاندنی هۆنراوەکانی دیلان . نووسەر لە بابەتی جوانی‌و سروشتو ، دڵداری‌و جوانی ئافرەتو دیلانی نیشتمان پەروەرو ئاشتی خواز دەدوێت . لە پاشان دێتە سەر لایەنی هونەری شیعرەکانی باسی ڕوخساری هۆنراوەکانی‌و بەرهەمی شاعیرانو تاقیکردنەوەی شیعری دیلان دەکات .

## ● شێخ نوری شێخ صالح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی‌و ڕەخنەسازیدا .

لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عیراق لێکۆڵینە وەیەك بە ناوی شێخ نوری شێخ صالح ، لە نووسینی دکتۆر کامل البصیر دەرچوو ، کە نووسەر پێشەکییەکی بۆ نووسیوەو ئیایا ڕێبازی شیکردنەوەی خۆی دیاری دەکات کە پشتی بە بناغەی مێژوو و بناغەی هەڵسەنگاندن دەبەستێتو سێ خاڵ دەستنیشان دەکات :

**یەکەم :** بووژاندنەوەی ئەو کۆمەڵە وتارەو دووبارە بڵاوکردنەوەیان .

**دووەم :** دەستنیشان کردنی شوێنەواری ئەم ڕەخنە سازە کوردە لە ڕەخنەسازی جیهانیدا .

**سێیەم :** دۆزینەوەی سەرەتای زانستی مێژووی ڕەخنە سازیی کوردی .

لە ناوەڕۆکی نووسینەکەدا دکتۆر البصیر لە شێخ نوری‌و گۆران دەدوێ‌و ، باسی هونەری جوانو هونەری بەسوود دەکاتو لە سۆزی وێژەیی پێناسەی وێژەو مەسەلەی فۆرمو ناوەڕۆك لە وێژەدا دەدوێ ، پاشان دێتە سەر هۆنراوەو پەخشانو کێش‌و سەرواو کەسایەتیی وێژەرو بنچینەییەکانی کاری نووسین . لە کۆتاییدا لە شێواز دەدوێ‌و ئینجا سەرەنجامە

گشتی‌یەکان دەدات بەدەستەوە ، شـــێخ نوری شێخ صالح بەســـەرۆکی ڕێبازی تازەکردنەوەی هۆنراوەی کـوردی دەداتە قـەڵـەم‌و بـەیـەکـەم ڕەخنەســـــازی وێژەیی دادەنی‌و کە خاوەن شەخســـــیەتێکی تایبەتی خۆی بووەو بەزەبێتێکی کراوەو میشـــکێکی لێکدەرەوە ڕێگای داهێنان‌و خولقاندنی گرتۆتەبەر .

خوێنەر لە ئاستی بۆ چوونەکانی نووســەر دەوەستێ‌و بۆی هەیە کە بپرسێ ئایا چۆن نوری شێخ صالح بەسەرۆکی بزوتنەوەی نوێ کردنەوەی هۆنراوەی کوردی دەژمێردرێت ؟ کوا کارتێکردنی هۆنراوەکانی لە شیعری نوێ کوردی ؟ نوری شێخ صالح چ ڕێبازێکی شـــیعری لەدوا خۆی بە جێ هێشت‌و کام شاعیری کوردی شوێن پێی کەوت ؟ مەسەلەی نوێ کردنەوەو داهێنانی ڕێبازی تازە لە شیعری کوردی‌دا لە ڕێگەی چەند هۆنراوەیەکەوە مەیســـەر نابێ . ئەگەر دکتۆر کامل بەزۆرە ملێ بیەوێ لە دەوری گۆران کەم کاتەوەو نوری شێخ صالح بکات بەپێشرەوی کاروانی شـــیعری نوێ‌و نوێ کردنەوەی کوردی . ئەمە پێویستی بە بەڵگەو نموونە هێنانەوە هەیەو ، بنیاتنانی ســـاختمانی هۆنراوەی نوێی کوردی لەسەر دەســـتی گۆرانی نەمرو شاگردانی بەچەند بۆچوونێکی بێ بەڵـگەی دکتۆر کـامـل هەڵناوەشـــێتەوەو هیـوادارم لە دەرفەتێکی تردا بتوانم بە درێژی لەسەر ئـەم نووسینە شتێك بنووسم .

● بەندی‌و شێتخانە ..

« بەندی‌و شـــێتخانە » شانۆنامەیەکە کمال ڕۆوف هەنجیرەیی نووسیویەتی‌و هەر خۆشـــی لەســـەر شێوەی بریخت دەریهیناوە بۆ شانۆ . دەرهێنەر لەوتەیەکدا دەڵێت ..

« ئێمەو کـاکـەمەنـدو نـازە میـوانی ماڵی خومـانین ... میوانیش خـانـە خوێی‌یە » نانی وشـەم خولیایەکی نەسرەوتە لە سەر شانۆی سنگم دەی برژێنم‌و تیـکە تیکە هـەوالـەی مـالـە بێ حەوشـەکانی ئەکەم .

لەم شانۆگەری‌یەدا ئەمانە بەشـــــداری‌یان کردبوو : ئەکتەرەکـان داوەری‌یەکـەم ، حیکایەت خوانی دووەم ( بهادین نوری ) . نازەنین : نیـــاز عمر محمد سکینە . کاکـە مەند : ئاســـۆ عمر ( سوارە ) . هونەری‌یەکان بەرێوەبەری شـانۆ : ســـەربەرز عبدالغنی ، ڕووناکی : ســـــوارە محمد صالح ئاسۆ کریم ، جلوبەرگ .. شـیرین محمد امین .. بەیان سلمان .

دیکۆر : ســـەلام نەوروز ، جەواد محمد ـ محمود الشـیخ .

ئیکســوار : سەناء قاسم کوردی .

چاوەدێری هۆڵ : فەرهاد ڕەحمان ، بەهزاد حسن ، نەوزاد عمر خۆشناو .

پۆستەر : احمد مەرزوق .

ئەم شانۆگەری‌یە لەســـەر هۆڵی کۆمەڵە لــە ڕێـکەوتی ١/٤/١٩٨٢و ڕۆژانـی دوایـی‌دا تەمـــیل‌کرا . خەڵکێکی زۆر چاویان پێ‌کەوت‌و بەشداری‌یەکی وێژدانیان لەگەڵدا کرد . ناوەرۆکی شانۆگەری‌یەکە شتێکی واقیعی‌بوو ، بەشێوازێکی وێنەی شیعری دارێژرابوو . ئەکتەرەکان دەوری خۆیان بەچاکی بینی‌بەتایبەتی ئاسۆ عمر ( سوارە ) لــە دەوری کاکـە مەندا . نیـــاز عمر محمد ، سکینەش لەدەورەکەیدا درەوشـــایەوە ئیلقایەکی باشی هـــەبوو ، لە تەمسیل کردنی بەقسەو پانتۆ میم هەنگاوێك بەرەوپێشـــــەوە چوونی تیابوو . ئەمەش جۆرە ئازایەتی‌یەك‌و یاخی بوونێکی نواند کە دەبێ ئەکتەر هەندێ ســـــنووری کۆن تێك‌بداو ئازایانە بێتە مەیدانەوە .

بەراستی بەرهەمێکی ســـەرکەوتوو بوو . پەیرەو کردنی ڕێبازی بریخت‌و بەکارهێنانی ڕەمز شتێکی بەجێ‌و دروست‌بوو . دەبا بەرهەمی ئـاوا بەپێزو سەرکەوتوو هەر زۆر بێ .

# پۆستەی بەیان

### ● دیمەنێکی سەیر

بۆ خاوەنی کورتە چیرۆکی ( دیمەنێکی سەیر ) ، تکایە لێمان زویر مەبە بۆ بڵاونەکردنەوەی ، چونکە کورتە چیرۆکی سەرلەبەر هەندێ مەرجی تایبەتی خۆی هەیە ، جا بەم بۆنەیەوە ، داوات لێدەکەین کە هەندێ کورتە چیرۆکی سەرکەوتوو ، خۆماڵی ، یا لە ئەدەبی بێگانەوە بێ ، بخوێنیتەوە ئەوجا سەرلەنوێ نیازی دارشتنی کورتە چیرۆك بکە .

### ● بولبولێکی بێ تاوانو بەرخێکی بەسەزمان .

برای بەرێز ، ئەو هۆنراوەیەت کە بەو ناونیشانەی سەرەوە ناردووتە لە کاڵو کورچ دەکا ، ئەوەش ، ئێمە بە خەتای ئەوەی دەکەین ، کە خۆت بە شیعر خوێندنەوەو لێ وردبوونەوەی خەریك نەکردووە ، ئومێدەوارین کە لەمەولا ، زۆر بخوینیتەوەو زۆر کەم بنووسی .

### ● یارە جوانەکەم

ئەی خاوەنی هۆنراوەی ( یارە جوانەکەم ) ، پێشنیازمان ئەوەیە کە زۆر خوو بدەیتە خوێندنەوەی (هۆنراوەی وەسف) وەك گەشتەکانی گۆران ، هینەکانی قانیعو بەهاری مەولەوی ، ملەکەوەی شێخ سەلام و هی‌تر ، ئەگەر دەتەوێ فێری هۆنینەوەی شیعری وەسفی ببی ، ببی ، ببوورە .

### ● کۆسپ

برای شیرین ، خاوەنی هۆنراوەی « کۆسپ » ، برایانەو با بەینی خۆمان بێ ، ئەو چەند دێرە کە ئەو ناوونیشانەت لێ ناون ، زۆر کۆنن ، دەگەرێنەوە بۆ سەروکلاوی تایر بەگی جاف ، جا پێشنیازمان وایە ، بگەرێتەوە بەوانەی تایر بەگو ئەحمەد موختارو ئەوانداو لەگەڵ ئەوەی لای تۆ بەراوردیان بکەیت ، ئەوجا سەرلەنوێ هۆنراوەی نوێی خۆت بۆمان بهۆنیتەوەو بۆمانی بنێری .

### ● من سەربازێکم

بۆ خاوەنی هۆنراوەی من سەربازێکم، برا ببوورە هۆنراوەکەت وەك ، بیر ، جوان بوو ، بەڵام وەك قەوارەو وشە ئاوازو مۆسیقایان دووربوو لێیەوە ، دڵنیاین لەوە ، کە تۆ بێ‌وچان تێدەکۆشیو سەریش دەکەوی .

### ● بۆ مەهابادی خوێناوی‌و چوارچرا

ببوورە لەوەی کە نەمانتوانی هۆنراوەکەت کە بەو نێوونیشانەی سەرەوە هۆنیوتەتەوە ، بڵاوی بکەینەوە ئەویش لەبەر چەند هۆیەکو سەرەکییەکەیان ، هونەربی بوو .

### ● چاوەنواریی

بۆ خاوەنی هۆنراوەی چاوە نواریی ، دڵنیاین لەوەی کە دەتەوێ ببیتە شاعیرێکی ناودار بۆیە زیزنابێ لێمان ئەگەر بڵێی هۆنراوەکەت لەبەر هەندێ کەم‌وکوڕی بڵاو نەبوویەوە .

### ● لە پێناوی نان‌دا

کاکەی برا ، خاوەنی چیرۆکی « لە پێناوی نان‌دا » ، ئێمە لامان وایە ، کە تۆ ئەگەر بێتو زۆرتر بخوێنیتەوەو بە تایبەتی کورتە چیرۆك توانای ئەوەت هەیە ببیتە چیرۆکنووسێکی باش .

### ● گوڵێکی کۆچکردوو

هۆنراوەکەت کە بە ناوی گوڵێکی کۆچکردووەوەیە لە برا تام‌وبۆیەکی تایبەتی هەیە ، بەڵام لە ئاوازو قەوارەدا دەستی بڵاوکردنەوەی نەدا ، ببوورە .

### ● قەڵای دمم دمم

برای بەرێز ، خاوەنی هۆنراوەی قەڵای دمدم هۆنراوەکەت مەرجی بڵاوکردنەوەی تیادا نەبوو ، بە تەمای بەرهەمی بە پێزترتین .

### ● نەورۆز

بۆ خاوەنی هۆنراوەی نەورۆز ، ببوورە کە هۆنراوەکەت بڵاونەکرایەوە چونکە مەرجی بڵاوکردنەوەی تیادا نەبوو .

# هەرجارەی نووسینێک

دیارە نووسەرو ئەدیبو ڕۆشنبیر هەمیشە هەر چاوەڕوانی بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمەیە دەکات کە ناردوویەتی بۆ گۆڤارێ یاخود ڕۆژنامەیێ کە بە لایەوە شایەنی ئەوەیە بەرهەمی خۆیی تیادا بڵاو بکاتەوە ، ئەگەر هاتو نەختێکیش لەو وەختو وادەیەی کە خۆی بە نیازی خۆی دایناوە بۆ ئەوەی تیایا بڵاو بکرێتەوە دوا کەوت بێگومان هەوڵو تەقالایەکی جۆراو جۆر دەدات بۆ ئەوەی هۆی دواکەوتنی وتارەکەی لە بڵاوکردنەوەدا بزانێو ئەشتوانین بڵێین - زۆر کەمیان هەیە - جگە لەوانەیان کە ڕۆژێ لە ڕۆژان سبووچێکی کاری ڕۆژنامە نووسیو ڕۆژنامەگەریان بە دەستەوە بووە - بیریان بۆ ئەوە بچێ کە هەندێ هۆو تەگەرەو کۆسپی وەهای بێ چارەسەر دێنە پێشەوە ، ئەتوانین بڵێین بە خەویش نابینرێن .

ئێمە ، هەموو سەرپاکی ژانی نووسەرانو ڕۆشنبیرانو ئەدەبدۆسانمان سەر ژمێر کردووەو خۆیشمان تیایانا کولاوینو هەوڵو تەقالاشمان ئەوەیە دەرمانی سارێژکردنی هەندێ لەو ژانانە کە پەیوەندییان بە ( بەیان )ەوە هەیە بدۆزینەوە ، هەروەها بە تەماشین هەندێ لەو ژانانە کە بە هاریکاریی هەردوو لامان کپ دەکرێنەوە بیانخەینە روو .

لەم وێرد کردنە قووڵەی دەروونییەدا بەرەو دوواوە گەڕاینەوە بۆ پیاچوونەوەی دەفتەری ڕۆژانەی ژیانی باووباپیرانمانو ژانو چارەسەریانو هاتینە سەر ئەوەی پەیڕەوی کورد واتەنیەکەیان بکەین کە دەڵێ : ( چەپڵە بە یەك دەست لێ نادرێ ) یاخود ( کردەوەباش بە دوولا دەکرێ ) ، بۆیە لەم بوارەدا داخوازیمان لە ئێوەی خۆشەویست ئەمەیە کە ڕێكو پێك نووسینی وتارو ڕۆشنی ڕێنووسەکەیو شەرح کردنی هەندێ وشەی کە لەلای زوربەی خوێندەواران ڕۆش نییەو پاراوی زمانو ناوونیشان هەڵدانی سەرچاوەی لێوە ، وەرگێراو ، یا وەرگێڕدراو بە پامانیو زامانیو دەستپاکی لە وەرگێڕانداو دوور نەکەوتنەوە یاخود لانەدان لە ڕێڕەوی ( ڕێباز ) گۆڤارەکەو هەندێ شتی دیکە کە زۆر پەسەندە لای هەردوولا ، هەمیشە هەر سەر لەبەرەو نکوولی بڵاوکردنەوەی نییە .

شایەنی باسە ، دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە کاری ڕۆژنامەگەریی هەرگیز وتاری بێ پێزو بێ کەڵكو نەرۆیشتووی نەگێڕاوەتەوە ، بۆیە داوایان لێ دەکەین کە واز لەوە بهێننو لەوەش بهێنن بە جارێکا بینێرنە لای دوو جێگا گوایە ئەگەر ئەملا بڵاوی نەکاتەوە ئەوی دیکە بڵاوی دەکاتەوە !

لام وایە ، لای هەموان زۆر روون بێ کە دەستەی نووسەران مافی ئەوەیان هەیە کە بڕیاری بڵاوکردنەوەی وتارێ یا ماددەیەك بدەن یاخود بیخەنە لاوەو چونکە شارەزای هەموو لایەکن ، لایەنی هونەریی یاخود پالانتەیی ( ئیعلامی ) ، سەرەڕای ئەمەش ، بڕیاری ئەوەیان داوە کە هیچ جۆرە شتێ بۆ وتار یاخود ماددەیێ زیاد نەکەن بەڵام لەگەڵ ئەوەش - دا مافی قرتاندنو هەندێ هێمنکردنەوەیان بە جۆرێ هەیە کە پێی ڕۆیشتنی بۆ دروست بکات .

زۆر مەبەستە بە لامانەوە ئەوەتان بۆ روون بکەینەوە کە سەرپاکی ماددەو وتار ، ئەوانەی کە تا ئێستا بۆ ( بەیان ) هاتوونو هێشتا بڵاونەکراونەتەوە سەرلەنوێ دامانەوە لە تەڵەو پاكوپیسمان کردنو ئومێدەوارین لەمەولا بە پێی دووری ڕۆژی هاتنو پێزی وتارەکەو جۆری وتارەکەو شۆرەتی خاوەن وتار پەیتا پەیتا بڵاویان بکەینەوەو ئەوانەشیان کە رووی بڵاوکردنەوەیان نییە دەیانخەینە لاوەو ئەو بەرهەمانەش کە بەرهەمی لاوانو پێزی بڵاوکردنەوەیان نییە هەواڵیان لە پۆستەدا پێ رادەگەێنین ، ئەوانەشیان کە دەمووچاویان رووناکی بە ئەدەبی لاواندەدا ، بە تەماین لەمەولا گۆشەیەکی تایبەتییان بۆ بکەینەوە .

**محەممەد ئەمین هەورامانی**

به‌یان
مجلة ادبية شهرية
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد

رئيس التحرير
مصلح مصطفى الجلالي
رئيس التحرير

نائب رئيس التحرير
محمد أمين الهورامانى

**BAYAN** BAYAN

Litrary Monthly Magazine
Ministry of Culture and Information
Issued by: The Kurdish House for Culture and Publishing
Baghdad-Iraq

*CHIEF IN EDITOR*

***MUSLEH MUSTAFA AL-JALALY***

دار الحرية للطباعة - بغداد
نرخى «١٠٠» فلسه